







# گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی

٢٠٠٨



# گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی

**٢٧٠٨ی کوردی**

**٢٠٠٨ی زایینی**

کوردستان ـ هەولێر

# ناوەرۆك

# ڕێنماییەکانی بڵاوکردنەوە
# لە گۆڤاری ( ئەکادیمی ) کوردی دا

گۆڤاری ئەکادیمی گۆڤارێکی وەرزییە. لێکۆڵینەوە زانستییەکانی ناوەوە و دەرەوەی هەرێمی کوردستانی عێراق، بڵاو دەکاتەوە. بەگوێرەی ڕێنماییەکانی بڵاوکردنەوە، لێکۆڵینەوەکان بۆ پلەی زانستیی سوودمەند دەبن. بۆیە پێویستە لێکۆڵینەوەکان گرفت و ئاریشەکی دیاریکراو یان پێشبینی کراو، چارەسەر بکەن و، بیرو هزرێکی ڕەسەن یان تازە لە خۆ بگرن، یان لایەنێکی زانستی بدۆزنەوە. نابێت لێکۆڵینەوەکان لە هیچ گۆڤارێکی دیکە بڵاو کرابنەوە یان پەسەندی بڵاوکردنەوەی لەسەر درابێت.

# ڕێنماییەکانی تایبەت بە شێوە و ناوەڕۆك و پێکهاتووی لێکۆڵینەوە

(١) لێکۆڵینەوەکە، بە چوار دانە، لەسەر کاغەزی سپی پێوانە (A4)، بە مەرجێك لە هەر چوار لاوە، دووری (٢,٥)سم بەجێ هێشترابێت، دەنێردرێت. ژمارەی گشت لاپەڕەکانی لێکۆڵینەوەکە، بۆ زانستە ڕووتەکان و پراکتیکییەکان لە (٢٠) لاپەڕە تێپەڕ نەکات و، لێکۆڵینەوە زانستە مرۆییەکانیش، بە وێنە و خشتەکانیانەوە، لە (٢٥) لاپەڕە پتر نەبێت.

(٢) لەگەڵ لێکۆڵینەوەکە، هاوپێچێك هەبێت، ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە و ناو و شوێنی کارکردن و پلەی زانستی و کار و وەزیفەی لێکۆڵەر، لە خۆ بگرێت.

(٣) زمانی بلاوکردنەوە، زمانی کوردییە، بەلام لێکۆڵینەوە بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزیش بلاو دەکاتەوە. کورتەی لێکۆڵینەوەکەش Abstract، بە هەر سێ زمان دەبێت.

(٤) ناوەڕۆك و پێکهاتەی لێکۆڵینەوەکە بەم جۆرە دەبێت:

أ) ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە، بە شێوەیەکی کورت و پوخت و گشتگیر، لە ناوەڕاستی سەرووی لاپەڕەی یەکەم، دادەندرێت.

ب) کورتەی (Abstract) لێکۆڵینەوەکە، بە دوو زمانەکەی تر دەبێت، کە لێکۆڵینەوەکەی پێ نووسراوە، بەمەرجێك لە (١٥٠) وشە تێپەڕ نەکات و ئەو ئامانج و ئەنجامە لە خۆ بگرێت، کە لێکۆڵەر پێی گەیشتووە.

(ج) پێشەکی و ناوەڕۆك و ئەنجام.

(٥) شێوازی سەرچاوەکان لە پەراوێزدا:

أ) ئەگەر وەرگرتنی بێ دەستکاریی (الاقتباس) لە کتێب وەرگیرا، ناوی نووسەر یان دانەر بەبێ پاش و پێش، ناونیشانی تەواوی کتێبەکە، ناوی

بلاْوكەرەوە، چاپ (جگە لە چاپی یەكەم)، شوێن و ساڵی چاپكردن، لاپـەڕە، تۆمار دەكرێت.

ب) ئەگەر وەرگرتنی بێ دەستكاریی (الاقتباس) لە لێكۆڵینەوە وەرگـیرا، ناوی لێكۆڵەر، ناونیشانی لێكۆڵێنەر، نـاوی گۆڤـار، ژمـارەی گۆڤـار، شـوێن و ساڵی چاپ، لاپەڕە، تۆمار دەكرێت.

(٦) ئەگەر لێكۆڵینەوەكە ساغكردنەوەی دەستنووسێك لەخۆ بگرێت، پێویـستە ڕێوشوێنی بنەما و پرۆگرامی زانستی لەگەڵ لێكۆڵینەوەكە، هاوپێچ بكرێت.

(٧) بەرەچـــاوكردنی بیرۆكـــەی بنـــەڕەتی لێكۆڵینەوەكـــە، دەســـتەی نووسەران، ئـەو مافـەی هەیـە دەسـتكاری هەنـدێ لایـەنی داڕشـتن بكـات بـۆ ئەوەی لەگەڵ شێوازی بلاْوكردنەوەیدا، بگونجێت.

(٨) وا باشە لێكۆڵینەوەكە لەسەر (CD) تۆمـار كرابێـت و چـوار دانـەی ڕاكێشراویش لەگەڵیدا هاوپێچ بكرێت.

(٩) لێكۆڵینەوەكە، نیشانی سێ شـارەزای پـسپۆری بابەتەكـە دەدرێـت، ئەگەر پەسەند كرا، ئەوا لەلایەن دەستەی نووسەرانی گۆڤارەكە، ڕەزامەنـدی لەسەر دەدرێت.

(١٠) ئەو لێكۆڵینەوانەی گۆڤاری ئەكادیمی بلاْویان دەكاتەوە، دەربڕین لە بـیرو بۆچـوونی نووســەر دەكــەن، پێویـستییەتی دەربڕینـی گۆڤارەكـە، ناگەیەنن.

**دەستەی نووسەران**

# تعليمات النشر
# في مجلة ( الأكاديمي ) الكردية

المجلة مجلة فصلية. ينشر فيها النتاج العلمي من داخل وخارج اقليم كردستان ـ العراق. وتكون البحوث مستوفية للتعليمات الخاصة بالنشر وتخضع للتقويم العلمي. ويتعيّن ان يتضمن البحث حلاً لمشكلة قائمة أو متوقعة، أو يتضمن فكرة أصيلة أو جديدة أو اكتشافاً علمياً، على ان لايكون منشوراً أو مقبولاً للنشر في مجلة أخرى.

# التعلميات الخاصة
# بالشكل وترتيب البحث

١ـ يرسل البحث بأربع نسخ على اوراق بيضاء من قياس (A4) مع ترك مسافة ٢,٥سم من الجهات الاربعة، على ان لايزيد عدد الصفحات الكلية للبحث عن (٢٠) صفحة لبحوث العلوم الصرفة والتطبيقية وعن (٢٥) صفحة لبحوث العلوم الانسانية بضمنها الاشكال والجداول.

٢ـ ترفق بالبحث ورقة تتضمن عنوان البحث وإسم الباحث ومركز عمله، ومرتبته العلمية ووظيفته.

٣ـ لغة النشر هي اللغة الكردية، ولامانع لنشر بحوث باللغتين العربية او الانگليزية. وتوضع الملخصات Abstracts باللغات الثلاث.

٤ـ يرتب البحث على النحو التالي:

أـ عنوان البحث: يتوسط أعلى الورقة الاولى، ويفضل ان يكون قصيراً وشاملاً.

ب ـ يكون الملخص Abstract باللغتين الأخريين، على الا تزيد كلماته عن ١٥٠كلمة يوضِّح فيه الباحث الهدف من البحث والنتائج والتوصيات المهمة التي توصّل اليها.

ج ـ المقدمة والمتن والنتائج.

٥ـ اسلوب ترتيب المصادر في الهوامش.

أ ـ إذا كان الإقتباس من كتاب: يدوَّن اسم المؤلف. بدون قلب الاسم، عنوان الكتاب بالكامل، الناشر، الطبعة، (عدا الطبعة الاولى)، مكان وتاريخ الطبع، الصفحة.

ب ـ إذا كان الإقتباس من بحث: يدوَّن اسم الباحث، عنوان البحث، اسم المجلة الناشرة، رقم المجلة أو العدد، مكان وتاريخ النشر، الصفحة.

٦ـ حين يكون البحث تحقيقاً لمخطوطة تتّبع القواعد والمناهج العلمية المعروفة، وترفق بالبحث ست صفحات من المخطوطة.

٧ـ تحتفظ هيئة التحرير بحقّها في أن تحذف أو تعيد صياغة بعض الالفاظ، بما يتلاءم مع اسلوبها في النشر، مع مراعاة المحافظة على الفكرة الأصلية دون المساس بها.

٨ـ يستحسن ارسال البحث على CD وارساله برفقة النسخ المذكورة.

٩ـ يعد البحث مقبولاً للنشر، ويزوَّد الباحث بقرار هيئة التحرير بقبوله بعد عرضه على ثلاثة محكّمين (خبراء) من ذوي الاختصاص.

١٠ـ ماينشر في المجلة يعّبر عن وجهة نظر الباحث، وليس بالضرورة تعبيراً عن وجهة نظر المجلة.

**هيئة التحرير**

IRAQI KURDISTAN REGION
MINISTRY OF HIGHER EDUCATION
& SCIENTIFIC RESEARCH
UNIVERSITY OF SALAHADDIN - Erbil
Vice President Office
For Scientific Affair



هەرێمی کوردستانی عێراق
وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی
سەرۆکایەتی زانکۆی سەلاحەددین / هەولێر
نوسینگەی یاریدەدەری سەرۆکی زانکۆ بۆ کاروباری زانستی

ژمارە ٢/ ٨٩٤٩

مێژووی زاینی ٢٧ / ٥ / ٢٠٠٨
مێژووی کوردی ١٠ / ٧ / ٢٧٠٨

**بۆ/ ئەکادیمیای کوردی/ بەڕێز سەرنووسەری گۆڤاری ئەکادیمی کوردی**

**ب/ ڕەزامەندی**

**سلاو و ڕێز............**

ئاماژە بە نووسراوتان ژمارە /٣٥٤ لە ٢٠٠٧/١١/١٩ .

دەربارەی ڕەزامەندی ئەنجومەنی زانکۆکەمان لەسەر ئەوەی کە گۆڤارەکەتان ببێتە گۆڤارێکی ئەکادیمی/ زانستی و پشتی پێ ببەسترێت بۆ بلاوکردنەوەو بەرزکردنەوەی پلەی زانستی ، دوای ئەوەی کە خرایە بەردەم ئەنجوومەنی زانکۆ لە دانیشتنی کۆنووسی کۆبوونەوەی ئەنجومەنی زانکۆمان ژمارە (٨) ڕۆژی سێشەممە لە ڕێکەوتی ١/ ٤/ ٢٠٠٨ بەسترابوو. وە ئاماژە بە نووسراوی وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی ژمارە ن / ٢٣٥ لە ٢٠٠٨/٥/١٧ بە پەسند کردنی بڕیارمان دا بەرازی بوون و پەسندکردنی وەکو گۆڤارێکی زانستی / ئەکادیمی لەگەڵ ڕەچاوکردنی چەند تێبینی یەکی بچووک .......... لەگەڵ ڕێزدا

**هاوپێچ//**

- تێبینیەکان

د. محمد صدیق محمد
سەرۆکی زانکۆ

**وێنەیەک بۆ//**

- نووسینگەی بەڕێز سەرۆکی زانکۆ / لەگەڵ ڕێزدا
- نووسینگەی بەڕێز یاریدەدەری سەرۆکی زانکۆ بۆ کاروباری زانستی/ لەگەڵ بەراییەکان
- لیژنەی ناوەندی بەرزکردنەوەی پلەی زانستی لە سەرۆکایەتی زانکۆ
- دەرکردە

Kurdistan Regional Government
Presidency of Ministers Council
Ministry of Higher Education
and Scientific Research
Presidency of University of Koya
Office of President




حکومەتی هەرێمی کوردستان
سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی
سەرۆکایەتی زانکۆی کۆیە
نووسینگەی سەرۆك

ژمارە: ٧ / ٢٩ / ٢٧٨٩

بەروار: ٢ / ٦ / ٢٠٠٨

**«فەرمانی زانکۆیی»**

**بابەت / ناساندنی گۆفار**

ئاماژە بە خاڵی (١) تەوەرەی سێ یەم کاروباری زانستی لە کۆنووسی چواردەمین کۆبونەوەی ئەنجومەنی زانکۆ لە ٢٠٠٨/٥/٢١ وە دوای هەڵسەنگاندنی گۆفاری ئەکادیمی کوردی بڕیار درا بە :-

ناساندنی ئەم گۆفارە وەك گۆفارێکی ئەکادیمی و زانستی بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەکان و وەك گۆفارێکی ئەکادیمی مامەڵەی لەگەڵ بکرێت

پ. د. خدر مەعصوم
سەرۆکی زانکۆ

وێنەیەك بۆ:
- نووسینگەی بەڕێز سەرۆکی زانکۆ
- بەڕێزان یاریدەدەرانی سەرۆکی زانکۆ
- راگرایەتی گشت کۆلیجەکان
- دۆسیەی دەرچوو

www.koyauniversity.org

dnya

# ڕۆژهەڵاتناسی،
# ڕەگەزپەرستی و حەقیقەت

**پ. د. موحسین محەممەد حوسێن**

**پێشەکی:**

ئێمە ناتوانین نکوڵی لەوە بکەین کە بەڵێ ڕۆژهەڵاتناسان ڕا و بۆچوونی ڕەگەزایەتییان هەبووە، نەخاسمە کە ئەوان سەر بە جیهانێکی دیکەن و نەوەی جیهانێکی پێشکەوتوون. وێڕای ئەوە سیمای مێژوویەکی پڕ لە پێوەندی و دیرۆکێکی پڕ لە سەروسەختیش لەنێوانیدا هەیە کە پتر لە هۆکارێك بە مۆرکی تێك ترنجان و دەستە و یەخەی بێ مایە شەقڵی کردووە، نەخاسمە کاتێك پێ ئایینی ئیسلام گەیشتە ئەو جێگایانەی کە بەشێکن لە جیهانی مەسیحی بەتایبەتیش (ئەندەلوس). پاشانیش ڕۆژاوا ئۆردوگای خاچدروشمانی لەناو جەرگەی جیهانی ئیسلام بەردا کە دوو سەدە درێژەی کێشا و هیچیشی بە هیچ نەکرد، ئەوجا شەڕ و جەنگی (سەندنەوەی) خاکی ئیسپانیا هەڵایساو وەدەرنان و دەرکردنی ئیسلام لەو وڵاتە دەنگی دایەوە، بەدووی ئەوەشدا، زۆری نەخایاند عوسمانییەکان شاری قوستەنتینییەیان داگیر کرد و کردیان بە پایتەختی ئیمپراتۆرییەتە لە سنوور نەهاتووەکەی خۆیان. لە کۆتاییشدا بزاڤی ئیستعمارگەری سەری هەڵدا و ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوای وڵاتانی ئیسلامی پاکە و پاك و سەرلەبەری داگیرکرد.

هەموو ئەو سەر و سەخت و پێوەندییە ناشایستە و نالەبارانە، لە هەست و دەروونی گەلانی خۆرهەڵات و خۆراواشدا بیرەوەرییەکی تاڵی وەجۆش هێنا. جا ئەو میراتە شڕوشێواوە، هزرێکی هەند تەڵخ و تاریکی لە

مێشکی رۆژاواییاندا گەواڵە کرد کە سروشتی ئەو تێك ترنجان و پێکدادانانە بە زەینێکی ڕەگەزپەرستانە لێکبدەنەوە، سەرباری ئەوە لە هەوڵ و کۆششی ئەوەشدا بوون کاڵای ناکامڵی کورت و کوێری تیۆرییەکانیان بەسەر باڵای گەلانی رۆژهەڵاتدا بسەپێنن، راشیانگەیاند کە گەلانی رۆژهەڵات نەك هەر ناتوانن شارستانێتییەکی بەرز و باڵای وەك ئەوەی رۆژاوا دامەزرێنن، بەڵکو هەتاهەتایشە هەر لە زیندانی تاریکی پاخستەیی و پاشکەوتووی خۆیاندا دەمێننەوە.

هەر لە هەمان کات و وەختی ئەو لوول و گێژەنگەشدا چەندین شۆڕەسواری هزری هەموار لەبەرەی ئۆردوگای رۆژاوادا هاتنە بەر دید و بۆچوونی چەوت و چەوێڵ و هزری هەڵە و پڕوپووچیان شەرمەزار کرد و بەدرۆ خستەوە. هەر بە نموونە: (اوزواڵد شپنگر، ارنولد توینبی، جان پۆل سارتر، اشیلی مۆنتاغیۆ، ناعوم چۆمسکی و) کەسانی دیکەش لەو هزرمەندانەن کە تیۆری بنەمای رەگەزیان رەت کردەوە و پێی قایل نەبوون و، پاشکەوتەیی گەلانی جیهانی سێیەمیان بە پلەی یەکەم خستە ئۆباڵی ژینگەکەیان نەك ئۆباڵی رەنگی پێست یان قەبارەی کەللەسەر یان سیمای دەموچاو و رەنگی قژ و کەموکورتیی باڵا.

ئەم لێکۆڵینەوەیەش بەو نیازە ئامادە کراوە و سەروبەرنراوە بەرپەرچی تیۆرییەکانی هەندێ لە هزرمەند و رۆژهەڵاتناسان بداتەوە کە کوێرانە بە گۆچانی رەگەز رەگەزێتی نووسەرانی بە نموونە، وەك (گوبینیو، شوفین، ارنست رینان، چامپرلن، گرانت، جیرارد دی نرفال) و نووسەرانی دیکە دەڕۆن و ساتمە دەکەن، روونتر بڵێین ئەو هەندە هزرمەند و رۆژهەڵاتناسانە بە ئەقڵی شێواوی ئەو نووسەرانە بیردەکەنەوە. دەبی ئەوەش

بزانین کە تیۆر و هزر بە تەنیا لەسەر ئـەوان تـاپۆ نـەکراوە، دەبیـنین کـە لـە هــەمان ئــەو ســەردەمەدا ڕۆژهەڵاتنــاس هەنــە خۆیــان لــەو هــزر و بــاوەڕە ڕەگەزپەرسـتییە ڕەش و بوغزاوییــە بــە دوور گرتــووە. چـونکە ئــەزموون و تاقیکردنەوەی بایۆلۆجی و سۆسیۆلۆجی و بەرەو چاتر گـۆڕانی شارسـتانێتی لـە وڵاتـانی ڕۆژهەڵاتـدا ئـەوەیان سـاغ کردووتـەوە کـە ئـەم وڵاتانـە توانـستی ئەوەیان هەبووە پـێ هەڵگرن و بگەنە کاروانی شارسـتانێتی و سـەرەنجامیش سەلماندیان کە ئەو تیۆر و هزرە ناکامانە چەوت و هەڵەن و لەسـەر پڕوپـووچ بنیاد نراون.

لــە کۆتاییــدا، دەمــەوێ بڵــێم، زاراوەی (ڕۆژهەڵات) و (ڕۆژاوا) چ لــە مێژووی کۆن و چ لە مێژووی ناوین و چ لە مێژووی نوێدا، دەرهەق بە واقیعـی جوگرافی و لەڕووی بەرژەوەند و مەسڵەحەتی زلهێزەکانەوە، مانا و مەبەستی جۆراوجۆر و ڕێژەییان هەبووە و هەیە.

* * * * *

ڕێی تێ ناچی و نـاتوانین بڵـێین کەڵکەڵـەی ڕەگەزایـەتی لـە مێـشکی ڕۆژهەڵاتناسـاندا بــە دیارنەکــەوتووە. بــەڵێ، ڕاســتە ڕۆژاوا لــە لێکۆڵینــەوەدا بەرنامەی زانستیی خۆی پێڕۆ دەکا، بەڵام خۆ، لای خۆ، سـەر بـە جیهـانێکی پێشکەوتووە و، کاتێك لە چەندین کۆمەڵگای دواکـەوتوو دەکۆڵێتـەوە کـە لـە پلەی شارستانی و بوارەکانی ڕووناکبیریی (زانست و مێژوو و وێـژە و زمـان و ... هتد)دا لەپاشن و بە تۆزی پای ئەو ڕاناگەن، خـۆ دەبـوو هـەر هـیچ نـەبی دەروونی خۆی لە تێبینی و بۆچوونی پێـشوەختە ڕزگـار کردبـا و هەڵوێـستی خۆی لە قۆرتی دەمارتوندی و ڕای ناحەزانە و "داخ لەدڵانە بە دوور گرتبـا...

به هەر حاڵ کەسانێکیش هەن بێلایەن نین، هەر بە لایەکدا دایدەشکێنن... دووریش نییە لە بێئاگایی و نەزانینەوە ئەو رەفتارە بنوێنن.

سەرباری سەرومڕ تێکترنجانی چ خوێناوی چ ئاشتییانەی لەگەڵ (رۆژهەڵات)دا، رۆژاوا بە گشت ئەتنی و مەزهەبەکانیەوە زادەی کۆمەڵێك هـزر و چاوەچاوە کە لە بنەماکانی بەرەو چاکتر گۆڕاوی و رشتەی رێکی ژینگەکەیەوە پەیدابوونە، هەر بۆیەکیشە ئەقڵ نایگری یادی رۆژانی خۆشی داگیرکردنی شام و میسر و باکووری ئەفریقیای لەبیر بچێتەوە و، یادەوەرییە تاڵەکانی حوکمی ئیسلام فەرامۆش بکات کە چۆن ئیسپانیا و صقلیە و قوستەنتینییەی داگیر کرد و بە لەشکری بێشوماریشەوە گەیشتە دەروازەکانی ڤیەننا و لە ناوچەکانی بەلکان (بۆلگاریا و بۆسنە و کۆسۆڤۆ) و قبرسیشدا پەلوپۆی هاویشت.

سەرباری ئەو رووداوانەش هەندێ لە ئەوروپاییەکان لەو قەناعەتەدان کە فەرق و جیاوازییەکی بنچینەیی و ریشاژۆ لەنێوان جەوهەر یان سروشتی جیهانی رۆژهەڵات و سروشتی جیهانی رۆژاوادا هەیە کە گوایا بەلای بەرژەوەندی دەستباڵایی رۆژاوادا شکاوەتەوە. قەناعەتی ئەو کەسانەش بە دەستباڵایی کامڵی و پێشکەوتوویی، لەسەر بیرۆکەی خەیاڵئامێزی خۆ بە چاکتر زانین دامەزراوە.

شێخی (الغزالی. م: ١٩٩٦) دەڵێ: رۆژاوا بێگومان لەوە دەگەڕێ سووکایەتیمان پێبکات و خاکمان داگیر بکات و ئیسلام برووخێنێت و یاساکانی لەناو ببات و کەلەپووریشی سووك و بێ نرخ بکات[1]. بە قسەی (ادوارد سعید)یش ئەوروپایی لەو قەناعەتەدایە کە لە سایەی کلتوورەکانیەوە ناسنامەکەی لە ناسنامەی هەموو گەلانی دیکەی غەیرە ئەورووپی بەرزتر و

بالاتره[٢]. هەروا (صادق جلال العظم) بەرپەرچی دەداتەوە و دەڵێ: ئەو نکوڵی لەو واقیعە تاڵەی ڕۆژاوا دەکات کە باری پاشکەوتوویی و دەمارگیری و کەللە شەقی و هەست بە نزمی لە ئاست ڕۆژهەڵاتدا باڵی ڕەشی بەسەر گشت ڕۆژئاوادا کێشابوو، بەتایبەتیش لە سەدەکانی ناویندا ڕۆژاوا بە درێژایی مێژوو کەیانێکی یەکگرتووی دەستبالا نەبووە و، ئەم دەستبالاییەش ـ وەك (العظم) دەڵێ: تەنیا بەروبوومی قۆناغێکی مێژووە و بەرقەرار نابی و ئەو ملکەچییەی (ئێستای) ڕۆژهەڵاتیش هەروا درێژە ناکێشی و بە ڕۆژاوا هەر دەگات[٣].

لە نەبەردی شەڕەنووسینی نێوان هەردوو هزرمەند (أدونیس و صادق العظم)دا، ئەدونیس دەڵێ: لە رووی داهێنانەوە بیگری واتا ئەگەر لە گۆشەی شارستانییەوە سەیری بکەی و بەمانا قووڵ و مرۆڤانەکەی سەرنجی بدەی ئەوە لەو بارەدا ڕۆژاوا هیچ شتێکی نییە لە ڕۆژهەڵاتی وەرنەگرتبی و لەوەوە فێرنەبی، ... ئەوە ئایین ... ئەوە فەلسەفە ... ئەوە شیعر و هۆزان ... ئەوە هەموو هونەرەکان ... هەر هەموویان ڕۆژهەڵاتینە ... فەرموو لە دانتی و (کۆمیدیاکەیڕا) پێدا وەرە تا بە ئەمڕۆ دەگا. تایبەتمەندیی ڕۆژاوا لە میکانیزمەکەدایە نەك لە داهێناندا (!) لەبەر ئەوە دەتوانین بڵێین: ڕۆژاوا ئەگەر لەلایەنی شارستانییەوە لێی بنۆڕی (بەچکەی ڕۆژهەڵاتە) وەلێ ئەگەر لەلایەنی میکانیزمەوە سەرنجی لێ بدەی ئەوە لەو بارەدا (شتێکی نەگریسە = لقیط) واتا: لادانە، چەوساندنەوەیە، خۆسەپاندنە، ئیمپریالیزمە، بە واتایەکی تریش، هەڵگەڕانەوەیە لە باوك. جا ئەمڕۆ بەم هەڵگەڕانەوەیەش داناکەوی بگرە دەیەوێ باوکەکەش بکوژی[٤]. ڕاستیشت دەوێ ئەوە لە قسەی هۆزانوانان دەچی.

(العظـم) دەڵـێ: (ئـەدونيس) بـۆ هەناسـەيەكيش سـڵ لـەو ئەنجامـە گوفتاری و كردارييانە ناكاتەوە كە لـەم هەڵوێستە دەكەونـەوە. لەبـەر ئـەوە مكـووڕە و لەسـەر ئـەوە پـێ دادەگرێ كـە هـەر دياردەيـەك لـە دياردەكـانی داهێنـان لـە رۆژاوادا گوايـا رەگەكـەی لـە رۆژهەڵاتـەوە ئـاو دەخواتـەوە يـان بەواتەی (أدونيس): "داهێنانە گەورەكان لە رۆژاوادا چ ئايينی چ فەلسەفی چ هونەركاری لە سنووری ميكانيزم ترازان تێپەڕيان كرد، واتـا سەرچـاوەكانيان لە (رۆژهەڵاتە) و جۆرێكە لـە (بـە رۆژهەڵاتيكردنـی رۆژاوا ـ شـرقنة الغـرب)"[٥].

هـەروەها (العظـم) قـسەكانی (أدونـيس)ی شـاعير وەبـەر رەخنـە دەدات كـە گۆتبـووی: "كـە سـەيری هـزری رۆژاوا دەكـەی ... لـە (رێكـی و پێكـی) و (ريزبەندی) و (بەرنامە رێژی)يان، سەرت سـووڕ دەمينـێ، بـەڵام كـە سـەيری هزری رۆژهەڵات دەكەی بە پێچەوانەوە هەڵدێر دەبينی، تەمومژی لـە قـووڵايی ئاسمانـدا دەبينـی، داهێنـەرانی رۆژهەڵات خۆيـان تەمومـژن، لەبـەر ئـەوە لـە ئاستياندا وا هەست دەكەی كە ترسێكی گەورەت لێ نيشتووە"[٦].

(العظـم) رەدی دەكاتـەوە و دەڵـێ: زۆر جوانـە ... بەشـی ئێمـە تەمومـژە و بەشـی ئـەوان سـاماڵێكی ديكارتييـە ... بەشـی ئێمـە هەڵـدێر و هەرەسە و ... بەشی ئەوان بەرەو بەرزی گۆڕان و هەميشە نوێی مێژووە ... بەشی ئێمە ترسێكی ميتافيزيكييە و ... بەشـی ئـەوان لـە سـێبەری زانـستی ياساكانی جووڵانی ماددە و كۆمەڵگەدا ئارامی و دڵنياييە ... بـە ڕاسـتی ئـەم دابەشـكردنە ... دابەشـكردنێكی رۆژهەڵاتناسـانەی نـاڕەوای (أدونـيس) سازييە[٧]. وا دەردەكەوی (أدونيس) شوێنی پێی گۆڕان و پەرەسەندنی ئەم دوو لايەنە (رۆژهەڵات ـ رۆژاوايە)ی لە هزردا بە وريايی هەڵگرتبی. ئەم گۆڕان و پەرەسەندنەش رەنگدانەوەی قۆناغ بە قۆناغی رووداوەكانی مێـژووە. مانـای

(رۆژاوا) كه لەم بوارەدا مێشكی داگیركردووه واتایەكه جێگایەكی جوگرافیایی دیـاركراو نـاپێكی و لەگـەڵ بـەردەوام بانگهەڵـدانی (نـەرۆژاوا، نـەرۆژهەڵات)[٨] پێچەوانەیە.

ئەم دوو واتایە، یان ئەم دوو ئاراسته جوگرافییـە، هـەر لـه بنەڕەتـدا راست نەبوونه و تەنیا لەچاو هەردوو ناوچه و هەردوو هەرێمەكەیانەوه نەبی ـ به نموونه ـ رۆژهەڵاتی ناوین و هندستان و ناوەندی ئاسیا لەڕووی جوگرافیاوه بەپێی كلتووری جاپان و چین به رۆژاوا له قەڵەم دەدرێن.

بیٚ سەرنجی و لێڵایی وشەی (رۆژاوا)یان لـه چـاو بـزر كـردووه، _بـه نموونه ـ ئەم وشەیه شتێكی جێگیر و نەگۆڕ پیشان نادات، بـەڵكو وشـەیەكی رێژەییه و دەتوانریٚ به هەر ناوچەیێك له ناوچەكانی ئەو سەرزەمینه بگوتریٚ بەمەرجێك له جێگایەكەوه تا چاو بڕ دەكات بڕوانی. ئەو وشـەیە، بەتایبـەتی پێش سـەردەمی ئەسـكەندەر لـەلای یۆنانییـەكان (گریكـەكان) مانـای وڵاتـی فارس بووه، پـاش ئـەو سـەردەمەش ناوچـەیەكی بـەرفراوانتری گرتـەوه، تـا گەیشته سنووری چین، و له سەدەكانی ناوینیشدا وڵاتانی ئیسلامی گرتەوه ، وەلیٚ لـه سـەدەی نوێـدا چـەمكی ناچـونیەكی لیٚ پەیـدا بـوو، چـەند پـتر لێكۆڵینەوەی جیۆپۆلیتیـك بـەرفراوانتر بـی زەمینـەی ئـەو وشـەیه (رۆژهەڵات) دوورتـر دەگرێتـەوه و مانـا كۆنەكـەی دەدات لـه كـورتی، بەتایبـەتیش لـه دوادواكـانی سـەدەی نۆزدەمینـەوه شانبەشـانی بـەرفراوانبوونی جموجـوولٚی ئیمپریالیزم، مانای ئەم وشەی رۆژهەڵاتـه لـه گۆڕاندایـه. پاشـان بـەو ناوچـانه دەگـۆترا كـه لـه رۆژهەڵاتـی دەریـای ناوەڕاسـتەوه درێـژ دەبیتـەوه تـا ئـەو ناوچانەی كه هندستان و چـین و جاپـان دابەشـیان كـردووه. پاشـتر (رۆژاوا) دوای شەڕی دووەمی جیهانی و، دامەزرانـدنی چـەندین سیـستەمی سۆشـیاڵی

دیکە، بە ناوچەیەکی بەرفراوانی خودی ئەورووپا دەگوترا، تا بووە زاراوەیەکی سیاسی، و ـ یەکێتی سۆڤیەت نەبی ـ هەموو دەولەتانی رۆژهەلاتی ئەورووپا (سەربازگای رۆژهەلات)ی گرتووە هەرچی زاراوەی (رۆژاوا)یە، ئیدی بە بالای ئەو ولاتانەدا بڕدرا کە شارستانێتی نوێی رۆژاوایان داهێنا کە (ئەزوالد شپینگلەر ١٨٨٠-١٩٣٦ Oswald Spengler) بە (شارستانێتی فاوستی) ناوی دەبات، و ئەوڕۆش بە ئەورووپای رۆژاوا ناسراوە. (عبدالرحمن بدوي) دەلێ: ئەم ئاژاوەیە کە دوو زاراوەی (رۆژهەلات) و (رۆژاوا) بەرپای دەکەن، لێیانگەڕێین و بە یەکجارەکی وازیان لێ بهێنین باشتر نییە؟ خۆ چەمکی ئەم دوو زاراوەیە جگە لەوەش نە بە شێوەیەکی دۆستانە و دلپاکانە بگۆ و بشنەوی پێکراوە، و نەبڕیاریشی لە سەرە کە بە دوو هەرێمی هاوسێ سەیر بکرێن و لێکتر تێبگەن، و چاکە و بەرژەوەند ئالوگۆڕ بکەن ... نەخێر، بەلکو ئەم دوو زاراوەیە بۆ نانەوەی لێکدابڕان دەخرێنە کار یانیش بۆ قوولتر کردنی قۆرتی نێوانیان دەجاوڕێتەوە. خەلکی رۆژهەلات بەتایبەتیش ئیسلام، رۆژهەلاتی خۆی بە (مالی ئاشتی ـ دار السلام)، و مالی هەقیانەت دادەنێ، و مالی ئەوانی دی بەتایبەتیش رۆژاوا بە (مالی جەنگ ـ دار الحرب) دادەنێ، لەکاتێکدا خەلکی رۆژاوا، بە چەشنی ئیسلامی پێشین هەتا ئێستاش بە گرێی ئەو ترسەوە دەنالی کە باوو باپیرانی بە درێژایی سەدەها سال پێوەی دەنالاند، پاشانیش رۆژاوا دوای ئەوەی لە بوارگەلی جۆربەجۆردا پێشکەوت و سەرکەوتنی بە دەست هێنا، ئینجا ئەم ترسەی گۆڕی و کردی بە ئامێرێکی کاریگەر بۆ پەیداکردنی هاوکێشەیەکی پێچەوانەی بەرخوردار بۆ بەرژەوەندی خۆی، و بۆ لێکۆلینەوەی بوارگەلێکی کاروباری کلتووری ئێمە، واتا کلتووری گەلانی ئیسلام، بۆ ئەوەش (رێگای رۆژهەلاتناسیی) گرتەبەر.

(أدوارد سعيد) تەكەز لەسەر ئەوە دەكاتەوە كە جەوهەری (پێزی) ڕۆژهەڵاتناسی بریتییە لە فەرق و جیاوازیی نەكوژاوەی نێوان دەستبالایی ڕۆژاوا و سەركزیی ڕۆژهەڵات "دەستبالایی بیرو هزری ئەورووپایی دەربارەی ڕۆژهەڵات، دووبارە تەكەز لەسەر سەركەوتنی ئەورووپایی بەسەر دواكەوتەیی ڕۆژهەڵاتیدا دەكاتەوە"[٩]. ئەوەش ئەوە دەگەیێنی كە ئەو دووانە هەتا هەتایە ناگەنە یەكدی، واتا ڕۆژهەڵات بە بەرووبوومی هزری و ڕۆشنبیری و شارستانێتی خۆیەوە هەر بە ڕۆژهەڵات دەمێنێتەوە و، ڕۆژاواش بە بەرووبوومی هزری و ڕۆشنبیری و شارستانێتیی خۆیەوە هەر بە ڕۆژاوا دەمێنێتەوە یان وەك شاعیری ئیمپراتۆرییەتی بەریتانی (ردیارد كیپلینگ R.Kipling) دەڵێ: ڕۆژهەڵات ڕۆژهەڵاتە و ڕۆژاواش ڕۆژاوایە و هەتا هەتایە پێك ناگەن " East is east, and West is west, and never the twin will meet." ئەو شاعیرە شیعرێكی بەسەر (وەدەستهێنانی دارخورماكان و سنۆبەرەكاندا)[١٠] هەڵداوە هەرگیز لە بیر ناكرێ، ئەو دوو دارەش هێمای عیراق و هێمای هەرێمەكانی دیكەن و هێمای لوبنان و هەرێمە شاخاوییەكانی ناوچەكەن. هەروەها گۆرانیشی (شیعریشی) بەسەر خێر و بێر و بەرووبوومی هیندستانیشدا هەڵداوە و بگرە بە ئاواتی داگیركردنی هەموو شتێكی ئەو جیهانە (چۆڵ و هۆڵە و كەس لێ نەژیاوە!) شیعری نووسیوە (واتا چۆل لە دانیشتوانی ئەورووپایی!). جیهانێ، كۆمەڵگەلێكی دیكەی (غەیرە ئەورووپایی) پێشتر تێدا ژیابی ئەوە بەلای (تۆماس كارلایل)ەوە هەندەی نەدەهێنا كەس خۆی پێوە ماندوو بكات... (تۆماس كارلایل ـ Thomas Carlyle ١٧٩٥–١٨٨١) وتارێكی بە سەردێری (Chartism واتا بەڵگەنامە) لە ساڵی (١٨٣٩)دا نووسی تێیدا دەڵێ: زۆربوونی ژمارەی دانیشتووان، لەگەڵ

ئەوەشدا ئەگەر ئەم کەنارە کەمەی (بچووکەی) ڕۆژاوای ئەوروپا چڕ و پـڕ لـە دانیشتووان بی، ئایا هەموو جێگایەکی تـر، زەوییـەکی بـەتاڵ و چـۆڵ نییـە؟ واتا خۆی (زەوییە چۆڵەکان) بانگمان دەکات و دەڵێت: وەرن بمکـێڵن، وەرن بمدوورنەوە (درەوم بکەن)!... ئەم گۆشە چڕە بچکۆلەیەی ڕۆژاوای ئـەوروپا کەمە و پڕە، ئەو گۆی زەویەمان هێشتا نۆ لە دەی چـۆڵە! یـان سارانـشینە، هێـشتا هــەر هاوارمــان لێ دەکـا... وەرن... وەرن!... ئایـا ئــەو ئــەوروپا هەڵاوساوە بـە جۆشـەی کـە هـەرگیز ئـۆقرەی بـۆ نییـە... هـەر ئەوروپاکـەی خۆمان نییە کەوا جـارێکی دیکـەش هەسـتاوەتە سـەر پـێ و لەسـەر کـەناری هەڵمەتێکی زێدەگیریی بێ هاوتادا وەسـتاوە،... ئـەوەتا خـەریکی ململانێیـە هــەروەکو دارێکــی زەبەنــد ڕەگ و ریــشە دەهــاوێ ئــەوەتا خەریکـە بـۆ دەستلەملانێی هاوین تەکان دەدا لق و پۆپی پـڕ لـە گـەڵای پـان ... پـان بـۆ دوور دەهاوێ و بە یەکجاری هەموو ڕووی زەوی دەگرێتەوە[11].

مــادامێکی زەمینــی وڵاتــانی ڕۆژهەڵات (جیهانــە چــۆڵەکە) بێــت و مادامێکیش خەڵکی ڕۆژهەڵات هەر لە خۆیانەوە نەفام و بێ عەقڵن ئـەوا باشـتر وایە هـەر نـەزان بـن، بـەڵکو ... لـە بەرژەوەنـدی خـودی خۆیانـە بـە نـەزانی بمێننــەوە!... ســاڵی (١٩١٨) (تــی. ئــی. لــۆرنس T.E. Lawrence ١٨٨٨–١٩٣٥) نامەیەکی بۆ (ڤ. و. ریـشاردز V.W. Richards) نووسـی تێیــدا دەڵــێ: مــن دەزانم کــە لــەناو ئەوانــدا غــەریبم هــەر بــە غــەریبیش دەمینێمەوە... بەڵام بڕواناکەم لەوە خراپتر بن کـە مـن بتـوانم ڕێگـەی خـۆم بەردەم و ڕێگەی ئەوان بگرمەبەر[12].

وڵاتــی بیــانی ئــەو وڵاتەیــە کــە ئــەوروپا نەگریتــەوە، وەك (ممــدوح عدوان)ی شاعیر پێشکەشکەری کتێبی (ڕۆژهەڵاتناسیی جنـسی) یـان (وڵاتـی

غـەریب Xenophobia)[13] دەڵێـت: بـەڵکو ئـەو وڵاتەیـە کـە پێـچەوانەی ڕێزداری بەتین و بۆرجوازییەتی مامناوەندە. ئـەو نموونەیـە لـە بەرژەوەنـدیی دەوڵەتە ئیمپریالیستەکاندا ڕۆڵێکی بەرچاوی گێڕا و، تـا ئـەوڕۆش مـاوە و لـە کلتووری ڕۆژاوادا لەسەری دەڕۆن و لە سیاسەتی هاوچەرخی ئەمریکاشدا کـە بە درێژەی هـزری ڕۆژهەڵاتناسـانە و ئیمپریالیزمانـەی ئـەورووپا دادەنـرێ پێـڕۆ دەکرێت. ئەم نموونەیە لە (پارچـەکەی دیکـەی) جیهانـدا لـە شـتی غـەریب و عاجبـاتی و نامرۆڤانـە بـەولاوە هیـچی تـری تێـدا نـابینی[14]. گـەلان یـاخود (کۆمەڵان) بەپێی وەسـفی ڕەگەزچـییەکان پێویـستە لەسـەریان لـە نزماییـدا بمینێنەوە، چونکە نـاتوانن بـەرەوژوور بگەنـە ئاسـتی ڕۆژاوا و بۆیـان نـاکرێ بارێکی پێوانەیی پێویست Standard وەدەست بێنن و ئەو خەسـڵەتانەیان بەرکـــەوی کـــە (یاســـای ڕەگەزچـــیتی) یـــان (عـــورف و عـــاداتی ڕۆژاوا) دەیانسەپێنی.

بـەپێی ئـەم بۆچـوونە ناپەسـەندە، ئیـدارە بـە دەسـتە کۆلۆنیاڵییـە ڕۆژاواییـــەکان وەهـــای بـــۆ دەچـــن کـــە داگیرکردنـــی خـــاکی غـــەیری خۆیـــان مەسەلەیەکی ئاساییە و، زۆریش پێویست و بەجێیـە سـامان و بگـرە خـوێنی خۆیشیان بخەنە ژێر دەستی دەوڵـەتانی ڕۆژاوا. بـەو جـۆرە (ئـەڤلین بـارینگ کرۆمەر ـ Cromer ١٨٤١–١٩١٧) کـە یەکـەم جـار لـە هیندسـتان حـوکمی کردووە و پاشان بوویتە بە حوکمڕانی گـشتی لـە میـسر بـۆ مـاوەی بیـست و پێنج سـاڵ، ئـەم کابرایـە لـە زمـانی سـێر (ئەلفرێـد لایـل A.C.Lyall)ەوە ئەقڵی ڕۆژهەڵات وەسف دەکا و دەڵێ: لێوردبوونەوەی قووڵ بەلایەوە کـارێکی ئەستەنگ و زەحمەتە لەبەر ئەوە پێویستە هەموو مرۆڤێکـی ئینگلۆـ هینـدی ئەم ڕێسا بنچینەیە لەبیر نەکەن. هەروەهاش دەڵێ: ئەقڵی ڕۆژهەڵات گوفتاری

بەڕێ و جێی تێدا نییە و هەر بە ئاسانی هەڵدەوەشێتەوە و حەقیقەتی تێدا دێتە سەر هیچ و نامینێ، ئەم نەمانەش خەسڵەتی گەورەی ئەقڵی رۆژهەڵاتە. هەرچی ئەورووپاییە ئەوە ئەو بیرکردنەوەیەکی ئەقڵانیی قووڵ و وردی هەیە و لە هەڵسەنگاندنی حەقیقەتدا لێی تێکەڵ و پێکەڵ نابی، خواسایی خاوەن گوفتاری بەجێیە وێڕای ئەوەش کە زانستی گوفتاری نەخوێندبی، هەروەها بە گومانیشەوە تا بۆی ساغ نەبیتەوە هیچ حەقیقەتێك قبووڵ ناکات، زەکاوەتێکی قاڵکراوی ئەوتۆشی هەیە دەڵێی مەکینەیە. هەرچی ئەقڵی خەڵکی رۆژهەڵاتە ئەوە بەپێچەوانەوە، بەشێوە وەك شەقامگەلی شارە جوانەکانیان وەهایە. بەڵام رێکوپێك نییە. ئەوانە ـ لێرەدا مەبەستی لە وەچەکانی عارەبە ـ لە رادەبەدەر بە دەست نەزاندوویەوە گیرۆدەن. هەندێ جاریش ئاشکراترین مەبەستیان لە سادەترین مەتەڵ بۆ نادۆزرێتەوە هەرچەندیشە لە سەرەتاوە بە راستیشی دادەنێن(١٥).

ئینجا درێژە بە قسان دەدا و دەڵێ: هەر لە ئێستاوە دیارە رۆژهەڵاتییان و عارەب ناشی و خامن، گێلن، لە کارایی و بزاڤی دەستپێشخەریدا ناتوانا و بێبەشن، خولیای "پێداهەڵدانی پڕوپووچن"، تەڵەکەبازن، فێڵبازی سەر بە بەڵان، بۆ ئاژاڵان دڵڕەقن، ناتوانن بەسەر رێگا و شۆستەکاندا "سەکووەکاندا" بڕۆن. خەڵکی رۆژهەڵات ئاژاوەگێڕن، ئەوەی کە خەڵکی دانای ئەورووپا دەستوبرد تێی دەگەن، ئەوان تێی ناگەن، ئەورووپاییەکان دەزانن رێگا و شۆستە بۆ ئەوە دروست کراوە بەسەریدا بڕۆن، بەڵام ئەوان ئەوە نازانن، ئەوان لە درۆدا هەر لە کۆنەوە وەستانە، کەودەن و تەمبەڵن، دڵپیسن ... ئیدی ... دەماری ئەنگلۆسەکسۆن، روون و ئاشکرایە، دەستبەکارە، رەسەنە، بەڵام رۆژهەڵاتی لەمان ناچن و جیاوازن(١٦).

ئامرازەكانی راگەیاندنی رۆژاوا چ دیدەنی و چ خوێندنی موسـڵمان بـە چڵێس و داوێنپیس نیشان دەدەن، وەهایان نیشان دەدەن كە بە كـەنیزەكی زۆر بە سـەماكەر و بـە منـدالأنیش داناكـەون دەڵـێن موسـڵمانان چاوبەسـتن، درن، قـۆڵبڕن، فێڵبــازن ... لــە ئــالۆوێر و كــڕین و فرۆشــتندا بیانییــەكان هەڵدەخەڵەتێنن، هەروەها تیرۆریستن حەز بە تەقاندنـەوەی خۆیـان دەكـەن، حەز بە كوشتنی دەیەها خەڵك دەكەن، خەڵك دەفڕێنن، ئافرەت وەگیردێنن و ئەتكی دەكەن و ئەشكەنجەی دەدەن، پاشان دەیكوژن[١٧].

رۆژهەڵاتـی بـەلای ئەوانـەوە، نەخـشی سـەر بـەردە و وەكـو مـۆركی هەڵكەندراوە، ئادەمیزادێكی چەقیوە، نەگۆڕە یارای بەرەو چاتر گۆڕان نییە، هەتا ئێستاش وەكو ئـادەمیزادی سـەرەتایی "بـدائي" دەژی[١٨]. ئیـدی ئـەو وێنــە و نموونەیــە دووبــارە دەبێتــەوە ... وەلێ هــەر جێگایــەك ئــەوروپایی بیگاتێ، دەبینی، ئەوە هەر نەتەوەیـە و هـەر یەكـەیان بەشـێوازێكی سـەیر و سـەمەرە دەژیـت، سـەیر و سـەمەرەش لەوەدایـە كـە بـە زەوی و رەنێوهـات (الانتاج) و جوونی (نمط) گوزەران داناكـەوێ بـەڵكو سێكسیش دەگرێتـەوە. سێكـسیش بـۆ نامۆیـان پێویـستە شـتێكی سـەیر و عاجبـاتی بێـت، بگـرە شێوەكانیشیان هەر سەیر و نامۆیە. لەوێ فەرق و جیـاوازی لـەنێوان (ئێـرە) كە ئێمەین و لە ئـەوروپاین و لـەنێوان (ئـەوێ) كـە ئـەویتری لێ دەژیـت هەیـە "ئەویتر ... كە لە ئێمە جیاوازە otherness"[١٩].

بێگومان ئەم جوونە بیركردنەوە (دەمارگیرییە) هیچ ئایین و مەزەب و زۆربەی یاساكانی سەرزەمینیش پێـی قایـل نـابن، بـەلأم لـەبن پـەردەی خـۆ بەزلزانیندا كە رەگەزگەرەكان پێی هـەوێن كـراون دادەپۆشـرێ. ئـەم جوونـە یەكێكە لەو جوونە بەناوبانگانەی كە كۆمەڵناسان پۆلێنیان كردووە بـە نـاوی

"تیپۆلۆجیا = زانستی جنسەکانی ئادەمیزاد - یان زانستی مۆرکە جیاکەرەوەکانی کەسەکی Typology"[٢٠].

ئەو بارەو، واتا ئەو (حاڵەتی مۆرك و مۆرككارییە) بۆی هەیە بخرێتە سەر هەردوو لای هاوکێشەی "رۆژهەڵاتی و رۆژاوایی"یە. ئەو حاڵەتە لە قۆناغ بە قۆناغی مێژوو و لە حاڵەتی پێشکەوتن و حاڵەتی دیکەی دواکەوتنەوە پەیدا بووە. لە کاتێکدا بە مێژوو کردنی نوێکردنەوەی کۆمەڵگای ئەوروپا بەرەوپێش بەرەو دیموکراسی تەکانی دەدا، کە بۆ بنەماکانی کێبڕکێی ناوەوە دەگونجا، بەڵام واقیعیش ئەوەبوو کە بەرەو دەست بەسەرداگرتنی دەرەوەش تەکانی دەدا بۆ ئەوەی سوودی لێ ببینێ. ئەم تەکان و پەلهاوێشتنە، تەنیا بە هێزی چەك نەبووە، بەڵکو بەپێی دەقی ئەو ئایدیۆلۆجییانەش بووە کە ئەوروپای "مرۆڤی سپی" دایهێناوە، یانیش لەوە پەیدابووە کە ئەو ئەوروپاییە وا دەزانی کە خۆی بەرپرسە و "ئەرکی سەر شانیتی کۆمەڵگاکانی رۆژهەڵات بەرەو چاتر بگۆڕێ" و ... پاشان سواری ملیان ببی، و پێویستە (ئەوانیش) چ بە خۆشی چ بە کوتەك بە هەموو رێگە و شێوازێك بە دەنگییەوە بچن و ئەو ئەرکەیان پێ خۆش بی. گوفتاری سیاسییش لەگەڵ گوفتاری دیکەی (کلتووری - شارستانی)دا بەناویەکدا دەچوون، واتا لەو کاتەوەی کە (رەگەزەکانی تر) داخراو و (چەقیو) و چاولێکەر و خاڵی بوون لە داهێنان ئەوا پێویست بوو ببن بە دەسدای (تبعیة) کلتووری دەستباڵا، یەکەم لەبەر خاتری خۆیان و خزمەتکردنی خۆیان، دووەمیش بۆ خزمەتکردنی مرۆڤایەتی.

هەرچی دوو برا گەڕۆکە فەرەنسییەکانە (گیرۆم و جان تارو) ئەوە، ئەوان عارەب بە ئادەمیزادی خەیاڵ دادەنێن و دەڵێن هیچ پێوەندییەکیان

لەگەڵ گوفتاری بەجێدا نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە عارەب ماقووڵ لێك جیا ناکاتەوە و لەوەتەی هەیە نەیزانیوە دەوڵەت بۆ خۆی دابمەزرێنی یان رێکبخات چونکە بیرۆکە و هزری بەرژەوەندی گشتی لە عارەبەوە زۆر دوورە. جا ئەگەر عەرەبێکت دی بە پەرۆش بێت بۆ هزری پەرلەمانی، ئەوە لەبەر ئەوەیە کە دیموکراسی بۆ هەر سێ نەنگییەکەی (عەیبەکەی) دەلوێ، گوایا ئەو سێ نەنگییەش ئەمانەن: فشەی شێتانە، حەز بە چەنەبازیی سەرومڕ (لەناو هۆڵی پەرلەماندا)، رەفتاری ناشیرین[٢١].

ئیدی بەم هزرانە هەرچی بانگهێشتی (مرۆڤدۆستانە) و پاشماوەی بیروباوەڕی چاخی روونکردنەوە کە لەلای بیرمەندانی رۆژاوا هەبوون، بەرەبەرە بە تێپەڕبوونی زەمەن کۆن بوون و لەبیر چوونەوە و ئەو بیرمەندانەش درێژەیان بە هزری (مەرکەزییەتی ئەوروپی)دا، کە کۆششی رۆژهەڵاتناسی لەو هزرە جیا نەدەبووەوە. لەبەر ئەوە عاجباتی نییە کە (أرنست رینان و دی گوبینیو) و هزرمەندانی دیکەش کاریگەرییان لەو مەرکەزییەتە کردبێ کە بەپێی ئەوەش (ئەوانی دی) تەنیا وەك چەند ئەستێرەیەکی گەڕۆك دەبینرێن کە بە دەوری خۆردا دەگەڕێن. ئەو هزر و بۆچوونە لەلایەن گەلێك لە بیرمەندان و فەیلەسوفەکانی ئەورووپاوە ریسوا کرا، کە (ارنولد شپینگلر) و (ارنولد توینبی) و (أشیلی مونتاگو) و کەسانی دیکەش هەندێکن لەوانە.

رەگەزدۆست (رەگەزپەرست) بیروباوەڕی خۆی لەسەر بنەمای دوولایەن بنیاد دەنێ، وەکو ئەوەی (رینان) کە دەربارەی (رۆژهەڵات، رۆژاوا) یان ئاسیایی و، یۆنانی بنیادی نا. ئەوانە پشت بە تیۆری "ئەتینیات" دەبەستن نەك بە هێزی سەرەتایی و هەوەس. (رینان) خۆی، کە بە چاوێکی

گشتی سەیری رەگەزەکان دەکات لەو باوەڕەدایە کەوا ئەقڵی سامیی رۆژهەڵات مۆرکی تایبەتی گۆرانی و ستران و پێغەمبەرایەتی پێوەیە. ئەو ئەقڵە خۆی لە فەلسەفە لادەدات. (رینان) بزاڤی فەلسەفی بە بزاڤێکی نامۆ دەزانی لە کلتووری ئیسلامیدا، سیستەمە سیاسییەکانیشیان بە سیستەمی کەللەشەقیی بەرەڵا (استبدادية مطلقة) دادەنێ و دەڵێ: نکوڵیکردنە لە ئاوەز (الذكاء) و کوتەکێکە لە ئەقڵ دەدرێ. هزری ئیسلامیش بە گەندەڵییەکی ئەوتۆ لە قەڵەم دەدات کە شایان نییە ئەو بایەخەی پێبدرێ کە بە هزری پرپێزی یۆنانی و هیندی و یەهودی"جوولەکە" دەدرێ. ئەو کۆمەڵگایانەی ئایینەوانان (رجال الدين) دەیانڕانێنن و حوکمیان دەکەن کە ئیسلام باوترین و بڵاوترینی ئەو حوکمەیە (دەوڵەتی زۆرەملێی تاوانبار) و لە رووبەرێکی (پانتاییەکی) کەمدا نەبی حوکمی خراپەکاریی خۆی نازانی، بووەتە مایەی نکوڵی لە کرانەوەی ئەقڵ و ئاوەز و لێدانی ئەقڵ، واتا ژان و ئازارێکی مێژووییە و چەند لاپەڕەیەکە لە خەم و خەفەت.[٢٢]

ئەو گلەییەی لە (رینان) دەکرێ ئەوەیە کە ئەو بەرپرسە لە ئاڵۆزاویی (هزری رۆژهەڵاتی) و لە پەرەنەسەندنی زانستەکان لە وڵاتانی رۆژهەڵاتدا، ئەو باسی ئیسلام لەو پێگەیەوە دەنووسی کە خۆی مێژوونووسی زانست و هزرەکانە. ئەو رەگەزی عەرەب کە پێشەنگی حوکمە لە کۆمەڵگە و دەوڵەتی ئیسلامدا بەوە دادەنێ کە هەمیشە خەریکی شەڕ و جەنگ و داگیرکردنی وڵاتان بووە و دوژمنی فەلسەفە و دوژمنی بزاڤ و قسەزانیی ئەقڵانی بووە. ناوەرۆکی فەلسەفە ئیسلامی نەبووە ـ بە قسەی ئەو ـ بەڵکو لە سەرەتای دەوڵەتی عەبباسیدا بەبێ ئەوەی نەشونما بکا پەیدا بووە. پاشان باڵبەست کراوە . (ابن رشد) کە (رینان) لێکۆڵینەوەکەی خۆی لەسەر ئەو سازداوە ـ یەکێکە لە

بەرچاوترینی قوربانییەکانی. لەبەر ئەوە (رینـان) رای وایـە کـە "فەلـسەفەی ئیسلامی" ئیسلام خۆی نەیگووراندووە بەڵکو بە نابەدڵیی ئیسلام پەیـدابووە و، ناشتوانرێ هیچ راپـەڕینێکی زانستی و فەلـسەفی لـەناو گـەلانی ئیـسلامدا بهێنرێتە دی ئەگەر پێشەکی قورسایی ئایین لەسەر سینگیان لانەبرێ. پاشان لـە کۆتـایی شەڕەنووسـینەکانی لەگـەڵ ( جمـال الـدین الافغـانی)دا دەگاتـە ئەنجامێك، (هشام جعيّط) وەسـفی ئـەو ئەنجامـە دەکـات و بـە ـ سـاویلکەیی رەگەزپەرسـتانەی سـەدەی رینـان ـ نـاو دەبـات، کـە رینـان گوتوویـەتی: موسڵمانان یەکەم قوربانیی ئیسلامن.[٢٣]

(سـاطع الحـصري) لـە لابـەلاوە بەرپەرچـی رینـان دەداتـەوە، بـەبێ ئەوەی ناوی بهێنی دەڵێ: دەگـوترێ کـە خـوێنی ئێمـە سـامییە و، ئێمـە لـە سەرەتاوە هەر بە خۆڕسك لە نەتەوە ئارییەکان کەمترین ... ئەو قسەیە زۆر دوورە لە بنچینە دروستەکانی زانست ... چـونکە لێکۆڵینـەوە زانستییەکان قـەت و قـەت بـوونی رەگـەزی ئـاری و خەسـڵەتی ئـاری و خـوێنی ئـاری ناسـەلمێنی و رەگـەزی سـامی و خەسـڵەتی سـامی و خـوێنی سـامییش هـەر بوونیان نییە.[٢٤]

جـا بـا بادەینـەوە سـەر ئـەم پیـاوە (أرنـست رینـان)ە، ئـەم خـۆی مێـژوونووس و بیرمەنـدە، دەیزانـی هـەموو ئایینـەکان چـییان کـردووە بـۆ چارەسـەرکردنی تەنگانـەکانی مـرۆڤ و وەڵامدانـەوەی پرسـیارە سەرسوڕهێنەکانی و کپکردنی کینە و شەڕ و خراپـەکانی ... ئـەو ـ ئاقڵێتییـە بابەتییەش ـ کە بڕوای پێ هێنـابوو چـاکە گـەلی خـۆی هەیـە ... یـەکێك لـەو چاکانەی ئەوەیە کـە هـەموو ئایینـەکان بـە یـەك چـاو سـەیر دەکـا و قـەت و قـەتیش بـۆینی (التـزام) هیـچیان نـەبووە ... (رینـان)یـش ... وەك (جعـيّط)

دەڵێ: لە بنەماوە دژ بە بڕوای ئایینێکی دیارکراو نەبووە ... ئیسلامیش لە هەموو حاڵەتێکدا لە کەلەپووری زەبەنی ئاایینیی ئادەمیزاد جیانەکراوەتەوە.[٢٥]

ئەم لێکدانەوە رەگەزییانەیە کە دوورە لە ئایین هەندێ لە گەورە بیرمەندانی عارەبی بە دووی خۆیدا کێش کرد. ئەوە بوو شانۆنووسی ناودار (توفیق الحکیم) نووسیی: عەرەب ئەڤینی ژیانن چونکە لە دەستکێش هاتوونەتە دەر، خەو بە (تامی ژیان و زگتێرییەوە) دەبینن بەڕاددەیەك کە هەموو بیرو هۆشیان داوە بەو تام و چێژە "بەهەڵپە و خێرانە، تالآنچینە، حەزیان لە دزی و فڕاندنە چونکە عەرەب هەموو شتێك بە خێرایی و بە تالآن و چەپاوڵ و بە فڕاندن دەکات"... (الحکیم) هەر بەو پێودانگە کەسایەتیی عەرەب لێکدەداتەوە چونکە کەوتبووە ژێر کاریگەری تیۆرییەکەی (فولنی) کە تایبەتە بە هەلومەرجی ئاووهەوا. (فولنی) گەڕۆکێکی فەرەنسی بوو، لەساڵی (١٧٨٧)دا، واتا بەر لە شۆڕشی فەرەنسا و پێش دە ساڵیش لە هێرشەکەی (ناپلیۆن پوناپەرت) بۆ سەر میسر کتێبێکی خۆی بەناوی (سەفەرێك بۆ سوریا و لوبنان) بڵاوکردەوە.[٢٦]

(فولنی) لەو کتێبەدا، دەڵێ: سروشتی خاك و زەوی لەسەر بزاڤ و چالاکیی ئادەمیزاد کاریگەرە، ئەو کەسەی بە کولەمەرگی لە ژینگەیەکی هەژار و کەمدەرامەتدا بژی بۆ بنیادنانی شارستانێتی بە هەوەستر و چالاکتر دەبی لە دانیشتوانی ئەو هەرێمەی کە سروشت هەموو شتێکی پێ بەخشیوە، چونکە دانیشتوانی ئەم هەرێمە لەشقورس و تەمبەڵ دەبن، پشت بە سامانی ئەو سروشتە دەبەستن و خۆیان ماندی ناکەن. ئەوەتا مێژوونووسی گەورە (ارنولد توینبی) پاشتر لە فەلسەفەی مێژوودا دەڵێ: تەنیا تەنگانە و

نەهامەتی غیرەت و پیاوەتی و ورە دەبزوێنی، نزمی و بێدەنگیش دوژمنی هەرە گەورەی شارستانییە و ئەو ژینگەیەش کە شارستانێتیی تێدا دەتەقێتەوە (سەرهەڵدەدا) ژینگەی خۆش و ئاسان نییە، بەڵکو ژینگەی نالەبار و زەحمەتە.[٢٧]

ئەو لایەنە هزرییەی کە رابەرانی لێکدانەوەی رەگەزایەتی کردوویانە بە هۆی پێشکەوتوویی یان دواکەوتوویی کۆمەڵەکان، ناچاری کردن کە هۆکار و پێشەکی و زەمینەکانی خڕ بکەنەوە و بیکەن بە بیانووی ئەو ئەنجامە ئایدیۆلۆجییانەی کە بە دەستیان هێنا، ئەوان دەڵێن گوایا: زەکاوەت و هەڵکەوتوویی و وەستایی (دەستڕەنگینی) میراتێکە لە باووباپیرەوە بۆ منداڵەکانیان [٢٨] دەمێنێتەوە، ئینجا دێن، ئەو خەسڵەتانە وەها لێدەکەن کە لەگەڵ بنەمای ئایدیۆلۆجییەکەیاندا بگونجێ ... ئەو ئایدیۆلۆجیایەی کە دەیەوێ شان لە شانی زانستە سروشتی و فیزیکییەکان بدات، بەو جۆرە تیۆرییەکیان بنیاد نا بە نیازی ئەوەی پێودانگ و پێوەرە فیزیۆلۆجییەکان (بەشێوەیەکی ئایدیۆلۆجییانە) بخەنە کار، ئینجا هەستان شتێکیان داهێنا... ناویان نا (پێوەری کەللەی سەر) گوایا لەسەر پێوەندیی نێوان پانترین بەشی مێشك کە بدرێت لە (١٠٠) سەد و لە درێژییەکەی، گوایا بەم حیسابە زەکاوەتی تاکە تاکەی خەڵك و هی کۆمەڵەکانیش تاقی دەکەنەوە، ئیدی بەو پێودانگە ئادەمیزادیان دابەش کرد: (رەگەزی ئاری، ئەلپی، دەریای ناوەڕاست، سامی) بۆ ئەوەی (مافی زانستیی) خۆیان بەسەر چارەنووسی رەگەزە (پاشکەوتووەکاندا) بسەپێنن و دەستەمۆیان بکەن بەو جۆرە (رەگەزە باڵاکان ـ چاکەکان) تەنیا خۆیان دەتوانن ـ وەك رەفتارێکی ڕەوا و هەقیانەت ـ رەگەزەکانی تر بخەنە ژێر چنگی خۆیان.

لێکۆڵینــەوەی رووبــەڕوو (المیدانیــة) و، رابــوونی گــەلانی جیهــانی (رەنگەکانی دیکـە) ئـەوەی سـەلماندووە ئـەم جـۆرە تیۆرییـە لووتبەرزانەیـە (المحافظة) کە سەرانی کۆمەڵناسی لە رۆژاوا بە نموونە وەك (امیل دۆرکهـایم Emile Durkhiem) و (روبـرت ڤـوکس) و (سـوروکین Sorokin) و (ماکس ڤایبر Max Weber) و پارسونز Parsons) و (کارڵ فـین) و (هـ. س. چامپرلین) و (سودارد) و (گرانت) و (دی گوبینیـو) و دەیـەها کەسـی تـر ئاڵاکەیان هەڵگرتووە، تەنیا رەنگدانەوەی ئەو ئایدیۆلۆجیایەیە کە بە چاوێکی جیاواز سەیری جیهانی دەرەوەی ئەورووپا دەکەن.[٢٩]

وەڵێ قەیرانەکـە نـابی بـەو شـێوەیە کـە لـە زانـست لادەدات بخرێتـە بەرچاو، چونکە جیاوازیی فیزیۆلۆجیی سیمای ئادەمیزاد شـتێکی رووکەشـە. سەرباری ئەوەش پێکهاتەی قاڵبی گشت رەگەزەکان لە گۆڕانی بەردەوامدایە وێڕای ئەوەش کە ئەم گۆڕانکارییە ماوەیەکی دوور و درێـژی پێدەچـی تـا بـە تــەواوەتی دەکەوێتــە بەرچــاو. ئــەو گۆڕانکارییانــەش بــەهۆی ســەرومڕ تێکـەڵبوونی بـە کۆمـەڵی دانیـشتووانەوە، یـان لـە رێگـەی جووتڕەگییـەوە (تهجـین) دەکەوێتــەوە، کـە بـە قـسەی (أشـیلی مونتـاگیو) لـە هـەموو رەگەزەکانــدا روودەدات و ...هــەر رووش دەدات.[٣٠] ئاشکراشــە زانایــانی ئەنترۆپۆلۆژیا خەسڵەتە ئاوەزی و زەینییەکانیشیان، وەك پێوەرەکانی دیکە، بـە پێـودانگی فـەرق و جیـاوازیی نێـوان (رەگـەزەکان) دانـاوە. بـەڵام بـە گەشەسەندنی کلتوور لەناو گەلانی جیهاندا، دەرکـەوت و ئاشـکرابوو کـە ئـەو فەرق و جیاوازییە ئاوەزییەی لەنێوان خەڵکدا هەیـە، هەنـدەی لـە فێربـوونی کلتوورەوە پەیدابووە، نیو هەندە لە بنەما سروشـتییەکانەوە پەیـدا نـەبووە. هەر لەبەر ئەوەشە بەڵگە و بیانووی فەرق و جیاوازیی ئاوەز (زەین) ڕمیـا و ،

ئیـدی بـەهیچ کلۆجێـك ڕێگـای نـەدرا ببیتـە پێودانگێـك بـۆ پـۆلێنکردنی ئادەمیزاد.[31]

دوو جۆرە ئادەمیزاد نییە، یەکیان ڕژە ـ زیـرەك و دووەمیـان گـەلحۆ (بلید)، بەڵکو ئادەمیزاد یەك جەوهەرن. زانست هەر یەك زانستە چ بۆ خەڵکی رۆژاوا چ بۆ رۆژهەلاتی، بۆ ئەوەش کـە ئـەم حەقیقەتـە بـچیتە سـەر پێویستە (بیرمەندی رەگەزپـەرستی ـ دەستباڵا ـ) لە قاپووری پڕ لە خەیاڵی ناو زەینـی خۆی بێتە دەر و واز لە بۆچـوونی ناکـامی خـۆی بهێنـی، بـۆ ئـەوەی بتـوانی بڕیارگەلێك بدات لە هزری پێشوەختە چەقیوی ناو دەروونیەوە هەڵنەقولابن و نەکەوتبنــە ژێـر کاریگـەری سـۆز و بەرژەوەنـدی ئـەم و ئـەو. هـەمووشمان بەتەنگەوەین دیواری دابـڕی نێوانمـان لابـدەین و ئـەو بـوغز و کینەیـەش کـە لێکمان دوور دەخاتەوە لە دڵمان بشۆینەوە.[32]

ئەو قسە لە زانست دوورانە و، ئەو کۆشـشی خـەڵك سـووککردنە، کـە گوایا ڕێژەی زیرەکی لەنێوان پۆلەکانی ئادەمیزاددا جیاوازە و، بەپێی ڕەنگی پیست و موو و چاو و، بەپێی پرچی لوول و پرچـی خـاو و، شـێوەی لـووت و دەم و کوڵمەکان و ... شتی لەو جۆرە بابەتانەوە جیاواز دەبی. ئینجا لەسەر ئـەو هـزرە پڕوپووچـە تـۆی (تـۆوی) ناحـەزی و کینـە لـەناو کۆمەڵەکانـدا (نەتەوەکانـدا) بـچێنن، ئـەو هـەموو بۆچـوون و فـەرق و جیاوازییـە هـیچ پێوەندییـەکی لەگـەڵ حەقیقەتـە زانـستییەکاندا نییـە و تـەنیا بیروباوەڕێکـە دەمانباتەوە سەر هزر و لێکدانەوەیەك کە لەسەر بڕواهێنان بە ئاکار و خووی نـەگۆڕی ئـادەمیزاد یـان لەسـەر یارانـەبوونی (عـدم القابلیـة) بـۆ گـۆڕان و پەرەسەندن دامەزراوە. ئـەوە هـزر و ئـەقڵ نییـە، بـەڵکو خەیاڵـە چـیرۆکێکە لەمێژە (دەمێکـە) بـەهۆی کۆشـشی سەرسـەختانەی چـەندین کۆمەڵـەوە لـە

زەمەن بەجێماوە. یەك لەو كۆششانەش (ڕاگەیاندنی جیهانیی مافی مرۆڤە - جاڕدانی سەرتاسەریی مافی مرۆڤە) كە لە نەتەوە یەكگرتووەكانەوە دەرچووە و، سەدەها كتێبیش كە بۆ ڕسواكردن و بەدرۆخستنەوەی ئەو فەرق و جیاوازكارییە بەشێوەی زانستانە دانراون.[٣٣] ئەو ڕاگەیاندنە جیهانییانەی خوارەوەش دیسان ئەو خەیاڵە كۆنانە بەدرۆ دەخەنەوە: ڕاگەیاندنەكەی پاریس (بارەگای یۆنسكۆ) دەربارەی ڕەگەز لە تەمموزی ساڵی (١٩٥٠)دا دەرچووە، پاشان ڕاگەیاندنی ساڵی (١٩٥١)ی بەدوادا هات، ڕاگەیاندنی ڕێكخراوەی یۆنسكۆ دەربارەی ڕەگەز (ڕەگ) لە ئابی ١٩٦٤دا دەرچووە، ڕاگەیاندنێكیش هەیە لەژێر ناوی (ڕەگەز و زانست) ساڵی ١٩٦١ دەرچووە. ڕاگەیاندنەكەی مۆسكۆ دەربارەی (سیما بایۆلۆجییەكانی ڕەگەز) لە ئابی ١٩٦٤ دەرچووە، پاشان ڕاگەیاندنەكەی پاریس لە یۆنسكۆوە ساڵی ١٩٦٧ دەرچووە.

بەڵام ئەو شتەی كە دووریانەكەیان لێ دەكات بە سێڕیان ئەوەیە كە ڕۆژهەڵاتناسان تۆمەتی مژدەبەریشیان (التبشیر) خراوەتە پاڵ - بەڵام، خۆ مژدەبەران ئەم فەرق و جیاوازییەیان نەدەنایەوە و لەگەڵ بڵاوكردنەوەی باوەڕی مەسیحیدا داوای یەكسانیشیان دەكرد. ئەوەشمان لە بیر نەچی كە ڕاگەیاندنی دژ بە ڕەگەزپەرستی هەمیشە هەر لە یۆنسكۆ و دەوڵەتانی ڕۆژاواوە دەردەچی (نەك لە دەوڵەتانی ڕۆژهەڵاتەوە). دەوڵەتانی ڕۆژاواش لە هەمانكاتدا تۆمەتبارن بەوەی كە لەناو ڕەگەزەكاندا فەرق و جیاوازی دەنێنەوە، لەبەر ئەوە (ادوارد سعید) پشت بە لێكدانەوە جەدەلییەكان دەبەستی كە ڕۆژهەڵاتناسی جۆرە بیانوویەكە تا ڕۆژاوا دەست بەسەر ڕۆژهەڵاتدا بگرێت و، دەسەڵاتی خۆی بەسەریدا بسەپێنی.[٣٤] ناشتوانین

نکوڵی لەوەش بکەین کە ڕۆژاوا، لابالّی ڕەگەزدۆستانەی لە ڕۆژهەڵاتناسیدا بەپێی (خەیاڵی دەستباڵایی و خۆ بە زلزانین) بۆ بەرژەوەندی خۆی بقۆزێتەوە.

ڕۆژاوا لە سیمای ڕۆژهەڵاتدا کۆمەڵێك هزر و شێوەی خراپ و دوودڵی و کۆیلایەتی دەبینی، ئەو خەسڵەتانەش لەلایەن هەندێك لە ڕۆژهەڵاتناسانەوە داتاشراوە و دروست کراوە و گەورە کراوە، بەشێوەیەکی ئەوتۆش ڕۆژاوایان پێ لە خشتە بردووە کە بۆ دۆزینەوە و ناسین و دۆشینی ڕۆژهەڵات بکەویتە خۆ.[٣٥]

ئەو تەکەزکردنە لەسەر جیاوازیی نێوان ڕەگەزەکان خزمەتی بەرژەوەندی بەهێزەکەی تێدایە کە لە مێشکی خەڵکی (ڕەسەنی) وڵاتەکەدا تۆوەکانی دەچینی. (جان پۆل سارتر ـ J. P. Sartre ١٩٠٥–١٩٨٠) لەسەر زمانی "دانیشتوانی ڕەسەنی وڵاتەکەوە" دەڵێت: پێویستە لەسەرمان کاتی خۆمان بە فیڕۆ نەدەین ... با، واز لەو (ئەوروپایە) بهێنین کە هەمیشە هەر باسی ئادەمیزاد دەکات، کەچی لەهەر کوێیەکیش بیانبینی بەکۆمەڵ دەیانکوژی ... بە ناوی "گوایا ئەرکێکی ڕۆحیی ترسناك" لەسەر شانمانە.[٣٦] (فرانز فانون) دەڵێ: بیانی لە وڵاتە ژێر دەستەکاندا لە جێگای ترەوە هاتووە. بە ئامێر و چەکی خۆی، خۆی سەپاندووە، بەڵام وێڕای ئەو سەرکەوتنە و ئەو خاك و موڵك داگیرکردنەوەی هەر بە بیانی دەمینێتەوە. ئەو (جۆرە) مرۆڤەی کە لە جێگایەکی ترەوە هاتووە و لە دانیشتوانی ڕەسەنی وڵاتەکە ناچی، ئەوە "ئەوانی دیکەن"[٣٧]. جووتە وشەی (داگیرکار و داگیرکراو) هەر درێژە دەکێشی تا مرۆڤ لە مرۆڤایەتی دەخات، بگرە بە ئاژاڵیش لە قەڵەم دەدات. تۆ وەرە سەیری ئەو زمان و لەبزە بکە کە

داگیرکار لە وەسفی "دانیشتووانە رەسەنەکاندا" دەیخاتە گەڕ: لێشاوی رەگەزی زەرد (یان رەش)، تەرسی شارە رەسەنەکە، مێگەلە خەڵك، بەچکە هەڵهێنان، رێچکە مێروولەی جەماوەر ....تد[٣٨]

بەهێزی ـ دەستبالاّ، دەیەوێ دواکەوتنی ناچەرمگ (الملونین) یان دانیشتووانی رەسەنی وڵاتەکە بکات بە حەقیقەتێك، بە درۆ نەخرێتەوە. لەبەر ئەوە، (ئەوان) مافی ئەوەیان بە خۆیان داوە کە (لەئەوان) بکۆڵنەوە و بەوەش رێگا خۆش بکەن بۆ ئەوەی دەست بەسەر وڵاتەکەیاندا بگرن و خێروبێری بۆ خۆیان ببەن چونکە (دانیشتووانی رەسەن) ئەقڵ و هۆشی ئەوەیان نییە سامانی زەوی و زاری خۆیان وەبەر بینن، ئەوەش زیان لە ئادەمیزاد دەدات. ئیدی بەم جۆرە زمانی خۆ بەزلزانین و ئەو بیانووەی بۆ تالاّنکردنی سامانی کۆمەڵە کەمهێزەکان خستووەتە کار. لەبەر ئەوە ئەو هزرە لە ناوەرۆکی خۆیدا خەسڵەتی خۆ بەزلزانینی حەشارداوە و سۆز و بەزەییەکەشی وەلدا (لەگەڵدا) پێچراوەتەوە نەخاسمە کاتێك کە ناچونیەکیی دۆخی ئەو دوولایەنە نەك هەر تەنیا بە ژینگەی جوگرافی یان کۆمەلاّیەتییەوە هۆکار دەکا یان دەیخاتە ئۆبالّی قۆناغەکانی پێشکەوتن، بەڵکو بە ملی هەلومەرجێکدا ساغی دەکاتەوە کە رەگ و ریشەی لە سروشتی ئادەمیزادەوە ئاو دەخواتەوە و لە جیاوازیی پێوانە ئەخلاقییەکانی نێوان ئەو دوو لایەنەوە چەکەرە دەکات، هەروەها لەبەر ئەوەشە کە رۆژهەلاّت ـ بە ڕاو بۆچوونی ئەوانە ـ زیرەکی و زەکاوەتی لەباردا نییە کە بتوانێ شێوە و جومگە جۆراوجۆرەکانی بنەماکانی پێشکەوتن وەدەست بینی. هەر ئەم "قەناعەتە خەیاڵکردەشە" کە جوونەکانی (انماط) بیرکردنەوە و خەیالّ

لێدانی پێشوەختە بۆ سەلماندنی بوونی ناچونیەکی و جیاوازی دروستیان کردووە.

خۆ ئەگەر لە بارێکی دیکەوە لەو مەسەلەیە بنۆڕی ئەوە کەس ناتوانی نکوڵی لە بوونی جیاوازیی نێوان کۆمەڵەکان بکات، وەلێ ئەم جیاوازییە مانای ئەوە نییە کە لە زیرەکی و زەکاوەتدا جیاواز بن، نەخێر بەڵکو بەهۆی ژینگەوە رووی داوە. ژینگە هەیە بۆ چالاکی لەبارە، وەها لە کۆمەڵەکان دەکات بکەونە بزاڤ و کار بکەن و سەرومڕ بکەونە رەنێوهانین (الانتاج) و کۆکردنەوە و زۆرکردنی بەروبووم و دامەزراندنی شارستانی. ژینگەش هەیە لەبار نییە، زۆر گەرم و شێدارە، کۆمەلانی ئەو ژینگەیە شل و خاون و بە حوکمی ئەو ئاووهەوا نالەبارە پالیان لێداوەتەوە و کەمبزووتن. هەر ئەو ژینگەیە کار لە رەنگی پێست و پێکهاتەی سیمای دەموچاویش دەکات و شێوە و رەنگی مووی لەش و قژی سەریش هەڵەلوێنی (یکیّف)، هەر لەبەر ئەوەشە کە رەگەزپەرستان خەسڵەتی گێلی و دواکەوتووییان داوەتە پالّ ئەو کۆمەلانە.

راستیشت دەویّ ئەزموون و تاقیکردنەوەی زانستی ئەو جۆرە ئایدولۆژیایە بە قسەی پڕوپووچ دادەنیّ و ئەوەشی ساغ کردووتەوە ئەگەر پێست رەنگێکی دیارکراوی لیّ نیشت، ئەوە بۆ ئەوەیە کە خۆی بۆ ژینگەکە هەڵەلوێنی، ئەو هەڵەلوێنانەش دەیەها هەزار سالّ، بگرە سەدەها هەزار سالیشی پێدەچی تا دێتە دی. لە (رووی تیۆریشەوە) دەتوانریّ رەنگی پێست لە رێی دەستەمۆکردنی (التحکم) گلاندی رژێنی ماددەی (میلامین - Melamine)ەوە بگۆڕدریّ چونکە ئەو ماددەیە رەنگی توێژ و پێستی ئادەمیزاد دیار دەکات. ئەو حەقیقەتەش بە شێوەیەکی بنبڕ یان نیمچە بنبڕ

ئـەو هاشوهووشــە رەگەزدۆســتانەیە بــەدرۆ دەخاتــەوە کـە تەکـەز لەســەر جیاوازیی نێوان کۆمەڵان دەکاتەوە.[٣٩]

راستیشت دەوێ، رەگەزپەرستی لـە رۆژەڵاتناسـییەوە سـەری هەڵنـەداوە و، زادەی ئەو چاخ و سەردەمە نییە، بەڵکو هزرێکە لە دێر زەمانـەوە پەیـدابووە بەتایبــەتیش لــەلای جوولەکــەکان (الیهـود) کــە بــە خۆیـان دەڵـێن (گــەلی هەڵبـژاردەی خـوا) و لـەلای رۆمـی (الرومـان) کـە خـاوەنی (خـەیاڵی گـەلانی بەربەری)ن، یان لای ئەو کەسەی کە ئایەتی (کنـتم خـیر امـةٍ للنـاس تـأمرون بـالمعروف وتنهـون عـن المنکـر) (ئایــەتی ١١٠ لــە ســورەتی آل عمــران)دا بەشێوەیەکی رەگەزپەرستانە لێکداوەتەوە. مانای ئایەتەکـەش دەفـەرمووێ: (ئێوە باشترین گرووپێك بـوون کـە ئـەمرتان بـە چـاکە و نـەهیتان لـە خراپـە دەکرد)ـ چونکە ئەو سەردەمە هیچ (أمە)یەك بەو مانایەی ئێستا نـەبووە. لـە سەردەمی نوێشدا (نیچـچە ـ نیتـشە) دەیگـوت: (پێـشەوا مێژوویـیـەکان زێـتر پێویستییان بە خوێنی رەگەزپەرسـتی هەیـە نـەك بـە ئـەقڵ). هـەروەها (دی گوبینێو) کتێبێکی لەسەر جیاوازیی ئادەمیزاد داناو، ئـەو بلیمەتییانـەش کـە سەریان هەڵدا تـەنیا شاباشـی رەگـەزی (تیۆتـۆنی)یـان دەکـرد، (فریمـان)ی ئینگلیـزیش چـووە سـەر ئـەو بـاوەڕە، هـەروەهاش جوزیـف أرثـر، جمپـرلن، هوستین ستیوارت، تراتـشکی، برنـاردی و (گرانـت)یـش. ئـەم گرانتـە هـەموو رەگەزی باکوری (نۆردمان) بە بلیمەت لە قەڵەم دەدا نەك تەنیا هەر رەگەزی جەرمان.[٤٠]

"دنیس روگمۆنـت ـ Denis de Rougemont" دەڵـێ: فـەرق و جیاوازیی لە نێوان کۆمەڵەکاندا کـردەی سروشـتە و، ئـەو گەلانـەی لـە وڵاتـە ساردەکان و هەرێمە جۆربەجۆرەکانی ئەوروپادا دەژین زۆر ئازا و بە جەرگن،

بەڵام لە زیرەکی و فێربوونی سەنعەتدا ئاستیان نزمە. لەبەر ئەوە دەزانن ئازادییەکانی خۆیان بپارێزن، بەڵام ناتوانن دامودەزگایەك بۆ هەڵسووڕاندنی کاروباری خۆیان دابهێنن، واتا حکوومەتیان پێ دانامەزرێ، بە پێچەوانەی گەلانی ئاسیاوە، گەلانی ئاسیا زیرەکن و یارای سەنعەتن بەڵام ئازا و بەجەرگ نینە..."ئەو نووسەرە لە بیری چووە کە (هون) لەژێر فەرماندەی (أتیلا) و مەغۆل بە فەرماندەیی جەنگیزخان و تەیمووری لەنگ و فارسەکان لەژێر ئاڵای قەمبیز و کۆرش و نادرشاە چییان کردووە".

لەبەر ئەوە ئەو گەلانە لە دۆخی دەسدایی (التبعیة) و کۆیلایەتیی سەرمەدی و هەمیشەیی دەرناچن. هەرچی رەگەزی گریکە کە لە هەرێمەکانی ناوەڕاست دەژی، هەردوو خەسڵەتەکەیان هەیە، هەم ئازا و هەم زیرەك، ئازادیی خۆشیان دەپارێزن.[٤١]

شاعیری گەڕۆکیش (جیرارد دی نرفال) لە کتێبەکەیدا کە باسی سەفەری خۆی بۆ رۆژهەڵات دەکات، لەم بۆچوونە لای نەداوە و دەرهەق بە موسڵمانان دەنووسێ و دەڵێ: وا بزانم کەمێك شل بووبم بە هەوەسی ئەوەی کار لەو خەڵکە بێزار و بە کۆیلە کراوانە بکەم، کە هەمیشە کەوتوونە ژێر هەوا و هەوەسی بەهێز و رەفتەنی، دەبی ئەوانە بناسین تا بزانین حوکمی ستەمی سروشتی لە رۆژهەڵاتدا تا چ رادەیەك باڵی رەشی بەسەر ئەو خەڵکەدا کێشاوە، عارەب وەك سەگ وایە ئەگەر لەبەری هەڵبێین دەمانگەزێ و ئەگەر دەستی لێ هەڵبێنینەوە ئەو دەستەمان دەلێسیتەوە (ماچی دەکات).[٤٢] - قسەی ئەم شاعیرە لە حەقیقەت دوورە و، هەست دەهەژێنێ.

## سەرچاوە و پەراوێزەکان:


١ـ د. ولـيم الـشريف: المـسيحية، الاسـلام والنقـد العلمـاني. دار الطليعـة. بـيروت. ٢٠٠٠. ص:١٣٣.

٢ـ د. ادوارد سعيد: الاستشراق ـ المعرفة ـ السلطة. الانشاء. ترجمة كمال ديـب. مؤسـسة الأبحاث العربية. بيروت. ط١٩٨٤/٢. ص: ٤٢.

٣ـ د. صادق جلال العظم: ذهنية التحريم. مركز الأبحاث والدراسات الاشتراكية. نيقوسيا. قبرص. ١٩٩٤. ص: ٢٧–٢٨.

٤ـ مجلة (مواقف) العدد (٣٦)، ١٩٨٠، ص:١٥٠.

٥ـ د. صادق. س. پ. ل: ٨٠.

٦ـ مجلة (مواقف). هـ. ل.

٧ـ د. صادق. س. پ. ل: ٥٦.

٨ـ نسيب الحسيني. الغرب المتخيَّـل، رؤيـة الآخـر في الوجـدان الـسياسي العربـي. ترجمـة غازي برو. المجلس الأعلى للثقافة. ودار الفارابي. القاهرة. ٢٠٠٥. ص٣٤.

د. صادق. س. پ. ل: ٧٩.

٩ـ الاستشراق:٤٢.

١٠ـ هـ. س. ل: ٢٣٣.

١١ـ إرفن جميل شك. الاستشراق جنسياً. ترجمة عدنان حسين. دار قدمس. بيروت. ٢٠٠٢. ص: ١٢٩.

١٢ـ ادوارد سعيد له نامەکانی لورنس العرب، رسائل لورنس العـرب: The Letters of T. E. Lawrence of Arabia) وەرگرتووە. بڕوانە الاستشراق، ل: ٢٣٦–٢٣٧.

١٣ـ Xenophobia ـ زینوفۆبیا. بارێکی دەروونییە، واتاکـەی: رك و قـین هەڵـسان لـە بێگانان، و سڵەمینەوە لێیان.

يترجم بالبلد غير المريح، او المقزز الذي يثير نوعاً من الدهشة او الرهبة "أرهاب الغريب، او الاجانب". ارفن جميل: الاستشراق جنسياً، ص: ٣٤.

١٤ـ هـ. س. ل.

١٥ـ ادوارد سعيد. الاستشراق. ل: ٦٩—٧٠.

١٦ـ هـ. س. ل.

١٧ـ د. علي بن ابراهيم الحمد النملة: الشرق والغرب ـ منطلقات العلاقات ومحدّداتها. المركز الثقافي العربي. الدار البيضاء ـ المغرب. چ ٢/٢٠٠٥. ل:١٣٤.

١٨ـ إرفن، س. پ. ل: ٣٢.

١٩ـ هـ. س. ل.

٢٠ـ جاك ماهو: العنصرية منطق الأقصاء العام. موسوعة (صورة الآخر). مركز دراسات الوحدة العربية. بيروت. ١٩٩٩. ل: ٨٦.

٢١ـ جان جبور: المشرق في ادب الرحالة الفرنسيين، مجلة (الفكر العربي)، ژماره (٣٢) ١٩٨٣، ل: ٧٨.

٢٢ـ د. هشام جعيّط. اوروپا والأسلام. دار الحداثة. بيروت. ١٩٨٨. ل: ٥٢.

٢٣ـ هـ. س. ل: ٥٦.

٢٤ـ ابحاث في القومية العربية. مركز دراسات الوحدة. بيروت. ١٩٨٥. ل: ٩٨.

٢٥ـ د. هشام. س. پ. ل: ٥٣.

٢٦ـ جان پوارييه. و: نسيم نصر. منشورات عويدات بيروت ـ پاريس. ل: ٣٤—٣٥.

٢٧ـ أرنولد توينبي. مختصر دراسة التاريخ. و: د. فؤاد محمد شبل. جـ١ فصل ٦. موضوع (فضائل الشدائد). ل: ١٣٢. و بڕوانه: د. احمد محمود صبحي. فلسفة التاريخ. مطبعة جامعة قاريونس ـ بنغازي ـ ليبيا. ١٩٨٩. (نظرية التحديّ والاستجابة)

٢٨ـ د. السيد محمد البدوي. التطور في الحياة والمجتمع. مؤسسة الثقافة الجامعية. بيروت. ١٩٦٦. ل: ٢٠.

٢٩ـ د. نبيل السمالوطي. العلمية والموضوعية في علم الاجتماع. مجلة الكاتب. القاهرة. العدد (١٤٤) ١٩٧٣.ل: ٦٠—٦١.

٣٠ـ كتابه: الدحض العلمي لاسطورة التفوق العرقي. ترجمة المقدّم حسن احمد بسام. المؤسسة العربية للدراسات والنشر. چ٢/١٩٨١. ل: ٥٤—٥٥.

مونتاغیو ئەو کتێبانەی خوارەوەشی هەیە، زۆریان لە نیویۆرك بڵاوبوونەوە:

١ـ تمهيد للانتربولوجيا الطبيعية. ١٩٦١.

٢ـ الثقافة وتطور الانسان. ١٩٦٢.

٣ـ فكرة العرق. ١٩٦٣.

٤ـ مفهوم العرق. ١٩٦٤.

٥ـ أخطر خرافة للانسان ـ بدعة العرق. ١٩٦٤.

٦ـ الثورة البشرية. ١٩٦٧.

٧ـ الانسان والتعدّي. ٦٨.

٨ـ الثقافة: البعد التكيفي للانسان. ١٩٦٨.

٩ـ حاول ان تكون أنساناً. ١٩٦٩.

٣١ـ أشيلي، هـ. س. ل: ٨١.

٣٢ـ لە وەڵامێکی (کلود کاهین) لە گۆڤاری (دیو جین) بڵاو بوویتەوە، بۆ (انور عبدالملك) لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٣دا، بە ناونیشانی (الاستشراق في أزمة) بڕوانە: د. محمد ارکون وآخرون، لە کتێبەکەیدا (الاستشراق بين دعاته ومعارضيه). و: وأعداد هاشم صالح، دار الساقي، بيروت. ١٩٩٤. ل: ٣٦.

٣٣ـ هەندێ لە ناونیشانی ئەو کتێبانە دەهێنینەوە، بەبێ ناوی نووسەرەکانیان، بۆ خۆلادان لە درێژدادڕی: التنوع البشري، علاقة العرق، تبرير الابادة الجماعية، العرق المعقول والتافه، الجنس البشري يتطور، عار امريكا وخلاصها، الوراثة والعرق والمجتمع، التحيّز العرقي، اللون والعرق، الصورة السوداءفي الذهن الابيض، بشرة سوداء وأقنعة بيضاء، معذبو الارض، الغضب الاسود، السياسات العرقية، العرق والمدنية، تعليم الازدراء، قرن من العار، الابيض فوق الاسود، السيرة الذاتية لمالكوم اكس (داعية المساواة في امريكا) العلاقات العرقية، قصة مقتل مارتن لوثر كنگ، طفل اسود وطفل ابيض، الازمة في السود والبيض، الهنود الحمر الجدد، و کتێبی الضمير الابيض....الخ.

٣٤ـ الاستشراق، ل:٣٩.

٣٥ـ د. محمد عبدالحسين الدعمي. المتغيّر الغربي. الشرق، الاستشراق، أدب الصحراء. دار الشؤون الثقافية العامة. آفاق عربية. بغداد. ١٩٨٦. ل: ٨٣–٨٤.

٣٦ـ فرانز فانون. پزیشکێکی دەروونی بوو، لە ساڵی ١٩٢٥ لە دایك بوو لە دوورگەی مارتنیك لە کەنداوی مەکسیکدا، کە لە ژێر دەسەڵاتی فەرەنسا بوو. بەشداری لە شۆڕشی جەزایر کرد، و ئەم کتێبانەی لە بارەی ئەو شۆڕشەوە نووسی:

١ـ معذّبو الارض.

٢ـ سوسيولوجية ثورة الجزائر.

٣ـ بشرة سوداء وأقنعة بيضاء.

٤ـ في سبيل الثورة الافريقية.

فانون لە هەرەتی گەنجیدا لە ساڵی ١٩٦١ لە جەزایر مرد و هەر لەوێشدا بە خاك سپێردرا.

ئەو دەقەی سەرەوە لە نووسینی فەیلەسووفی بەناوبانگی فەرەنسا (جان پۆل سارتر)ە، کە پێشەکی بۆ کتێبەکەی فانون (معذبو الارض ـ چەوساوەکانی سەر ڕووی زەمین)ە. لە وەرگێڕانی د. سامی الدروبی و د. جمال الاتاسی. چاپی دار الطليعة ـ بيروت ١٩٦٦. ل: ١٧.

٣٧ـ هـ. س. ل: ٤٥.

٣٨ـ هـ. س. ل: ٤٧–٤٨.

لە بارەی بەرهەمەکانی و بۆچوونەکانی فانون، بڕوانە:

ديڤيد كوت. فرانز فانون ـ ترجمة عدنان كيالي ـ المؤسسة العربية للدراسات والنشر. بيروت. ١٩٧٢.

زاراوەی (العرقية، ڕەگەزپەرستی یەکەم جار بەرپا بوو لە ساڵی ١٧٨٧، واتە بەر لە شۆڕشی فەرەنسا بە دوو ساڵ، بەکارهاتووە لەلایەن نووسەر "جان شاڤین ـ شۆڤین)دا. بڕوانە جان پوارییە. س. پ. ل: ٣١–٣٢.

٣٩ـ بڕوانە: اشيلي مونتاغيو، الدحض العلمي. س. پ. لەو دوو بابەتەوە:

١ـ الفصل بين السمات الجسدية والخصائص الذهنية. ل: ٨١–٩٢.

٢ـ الفصل بين الانجاز الحضاري والشكل الجسدي. ل ٩٣–٩٨.

٤٠ـ بڕوانـه ئـەو دەيالۆگـە ئەندێـشە سـەيرەى "الحـوار المتخيّـل المـدهش" لـە نێـوان هەڵبژاردەى ڕووناكبيران و فەيلەسـووفەكانى مێـژووى ئەورووپييـەكان، لـە سـەردەمەكانى جۆراوجۆردا لە كتێبى: ول ديورانت. مباهج الفلسفة. و: د. احمد فؤاد الأهـواني. فەسـڵى (١٤) كتابى دووهەم. ل: ٢٤–٣١.

٤١ـ ثيري هنتش. الشرق المتخيَّل. رؤية الغرب الى الشرق المتوسطى. ترجمة غـازي بـرو ـ خليل احمد خليل. دار الفارابي. القاهرة. ٢٠٠٥. ل ٤١.

٤٢ـ هـ. س. ل: ٣٣٧.

## الخلاصة

# "الاستشراق، العنصرية والحقيقة"

أ. د. محسن محمد حسين

لايمكننا أن ننفي وجود توجه عنصري لدى مستشرقين. لاسيما إذا أدركنا انهم ينتمون الى عالم آخر، متقدم. إضافة الى تاريخ من علاقات إتّسمَّت بالاحتكاك السلبي، لأكثر من سبب. ولاسيما حين وصلت فتوحات المسلمين الى أماكن كانت جزءاً من العالم المسيحي، خاصة اسپانيا (الاندلس). ثم شنَّ الغرب حروبه (الصليبية) على قلب العالم الإسلامي. تلك الحروب التي دامت قرنين من الزمان، وانتهت بالفشل. ثم كانت حروب (الاسترداد) الاسپانية لطرد المسلمين من تلك البلاد. واعقب ذلك فتح العثمانيين لمدينة القسطنطينية، وأتخاذها عاصمة لدولتهم المترامية الاطراف. وأخيراً كانت الحركة الاستعمارية، والاستحواذ على البلدان الاسلامية شرقاً وغرباً.

كل هذه العلاقات خلقت شعوراً بالمرارة لدى شعوب الشرق والغرب معاً. وكان هذا دافعاً حمل الغرب الى تفسير طبيعة تلك العلاقات تفسيراً عنصرياً، إضافة الى أنهم حاولوا تطبيق نظرياتهم على شعوب الشرق. واعلنوا أن شعوب الشرق لاتستطيع أن تنتج حضارة راقية تضاهي حضارة الغرب، بل ان هذه الشعوب ستبقى أسيرة ماضيها وتخلّفها.

في الوقت نفسه ظهرت بين رجالات الغرب نخبة من المفكرين دحضت النظريات والرؤى الخاطئة او القاصرة، من بين هؤلاء أوزوالد شپنگلر، ارنولد توينبي، جان پول سارتر، اشيلي مونتاغيو و ناعوم چومسكى.... وغيرهم ممن رفضوا نظرية الأعراق، كما أنهم ربطوا تخلّف شعوب العالم الثالث بالبيئة بالدرجة الاولى، ولم يربطوه بلون البشرة وحجم الجمجمة او بملامح الشكل ولون الشعر او بطول القامة... الخ.

ان هذا البحث يحاول الردّ على تلك النظريات التي وضعها مفكرون ومستشرقون، مستندين على طروحات عنصرية لكّتاب من امثال: دى غوبينيو، شوفين، ارنست رينان، چامپرلين، گرانت و جيرارد دى نرفال وغيرهم. في وقت هناك مستشرقون نأوا بأنفسهم عن تلك الطروحات العنصرية البغيضة، لأن التجارب البايولوجية والسوسيولوجية والتطورات الحضارية التي حصلت في بلدان الشرق، اثبتت قدرة هذه البلدان على اللحاق بركب الحضارة. كما اثبتت خطل تلك النظريات والافكار القاصرة.

واخيراً فأن مصطلحي (الشرق) و (الغرب) كان لهما مدلولاتهما النسبية، حيال الواقع الجغرافي ومصالح القوى الكبرى، سواء في التاريخ القديم او الوسيط او الحديث.

## *Abstract*

# Orientalism, Racism and the Truth

**P. Dr. Muhsin Muhammad Huseyn**

It is undeniable that a number of Orientalists have a racial tendency. This is evident from the fact that they belong to a different and an advanced world. Moreover, there is a whole historical record of negative contact characterizing the relation between their world and the Orient. There are various reasons for this, particularly when considering that the Moslem canquests reached areas that were part of the Christian world, such as Spain (Andalusia). The west launched the Crusades at the heart of the Moslem world. These wars lasted two centuries and ended up with failure. Then, there were the Re-Conquesta Campaigns to drive out the Moslems from Spain. These wars were followed by the Ottomans' conquest of Constantinople, which they turned into the capital city of their wide empire. Finally, there came into being the imperialist movement aiming at taking over all the Moslem countries in the east and the west.

These relations created a sense of bitterness felt by the people of the east as well as the people of the west. This was a motive to explain the relations between both worlds in racial terms. Moreover, the westerners attempted to implement their theoris on the people of the east. They announced that the nations of the east cannot produce an

advanced culture to vie with the western culture, and that these nations will be slaves to their past and backwardness.

However, there appeared among the western elite, thinkers that refuted the erroneous views and faulty theories. Among them, there are these thinkers: Oswald Spingler, Arnold Toynbee, Jean-Paul Sarter, Ashely Montagu, and Noam Chomsky, as well as others who rejected the racid theory. They primarily linked the backwardness of the tird world with the environment. They did not relate it to phrenology (i.e, the colour of the skin, the size of the skull, the hair colour, the physical features, height, etc).

In the light of the above presentation, this research attempts to give an answer to the racial theories put forward by a number of thinkers and Orientalists relying on the racial theses of writers liue Gobineau, Chauvin, Ernest Renan, Chamberlain, Grant, Gerard de Nerval, and others. At the same time, there were Orientalists who kept themselves away from the ignoble racial theses because the biological and Sociological experiments, as well as the cultural developments, in the countries of the east proved that these countries could catch up with culture and cultural advancement. This reveals that the racial theories are wrong.

Finally, the terms "East" and "West" used to have relative connotations as to the geographic reality and the Great Powers' intelest whether in Ancient, Medieval, or Modern History.

# جووشە

پرۆفیسۆر د. وریا عومەر ئەمین

جووشە کردەییێکی زمانییە بە هۆیەوە دانەییێکی وەك ( وشە – مۆرفیم – برگە) دووبارە ئەکرێتەوە بۆ دارشتنی وشەی تر بۆ (دەربرینی واتای تر) یا بۆ (جێبەجێ کردنی ئەرکێکی رێزمانیی)

بۆ روونکردنەوەی ئەم لایەنە و چۆنیەتی دەرکەوتنی لە زمانی کوردیدا سەیرێکی ئەم رستانە بکە و لە واتای یەکە یەکەی وشەکانیان رامینێ :

١) أ – ئەچم نەختێ تەختە و مەختە ئەکرم.

ب – وریا بە بە قسەی سەختە و مەختە هەڵنەخەڵەتێ.

٢) أ – هەندێ ترێ و مرێم بۆ هێنا

ب – هەندێ پارەی کرێ و مرێم لەسەرە ئەبێ بە زووترین کات بیاندەمەوە.

لە قسەی ئاسایی رۆژانەدا ئەم جۆرە دەربرینانە زۆر بەر گوێ ئەکەون . وشەییێك دووبارە ئەکرێتەوە بە گۆرینی دەنگی یەکەمی بە ( م ) ، ( تەختە و مەختە ) و (ترێ و مرێ )..

(مەختە ) و ( مرێ ) لە ناو ئەم رستانەدا هەموو ( وشەن ) و ( واتا )یان ئەخرێتە پاڵ بە پێی ژینگەکەیان و یاسا هەیە بۆ دارشتنیان.

لە رستەی ( ١ – أ ) دا ( تەنیا تەختە نییە دەکرێ ، بەڵکو شتی تری وەك بزمار و بۆیە و کەلوپەلی دارتاشیی لەگەڵدا ئەبێ ( مەختە ) لێرە ئەو شتانە ئەگرێتەوە کە پەیوەندییان بەو جۆرە کارانەوە هەیە تەختەیان تیا بەکار ئەهێنرێ.

له( ١ — ب ) دا (مەختە) قسەی درۆ و دەڵەسە و فڕوفێڵ ئەگەیێنێ.
واتاکانی ( مەختە) ی ( أ ) زۆر لە هی ( ب ) جیاوازن.

لە رستەی ( ٢ — أ ) دا وشەی (مرێ) ئەوە ئەگەیێنێ کە تەنیا ترێ نەهێنراوە بەڵکو میوەی تری وەك سێو و قازمانە و هەرمێ لە گەڵدایە.

لە رستەی ( ٢ — ب ) دا وشەی (مرێ) ئەوە ئەگەیێنێ کە تەنیا پارەی کرێی خانووی لەسەر نییە بەڵکو قەرزی تریشی لەسەرە .

( مەختە )ی یەکەم پەیوەندیی سیمانتیکیی لەگەڵ ئەو کەرەسانەدا هەیە کە لەگەڵ ( تەختە )دا بەکار ئەهێنرێن. ( مەختە ) ی دووەم لەگەڵ ئەو چەمکانەی سیمای درۆ و فڕ و فێڵیان پێوەیە.

( مرێ )ی یەکەم پەیوەندیی سیمانتیکیی لەگەڵ میوەجاتا هەیە. (مرێ) ی دووەم لەگەڵ پارە و قەرز .

( مەختە ) و ( مرێ ) کە لە رستەکان دەرئەهێنرێن هیچ جۆرە چەمك واتاییێکیان نامینێ و ناشێ بخرێنە ناو فەرهەنگەوە. ئەم جۆرە وشانە خەسڵەتی ڤایرۆسیان پێوەیە . ڤایرۆس گەر لە دەرەوەی شانەی زیندوودا بێ مردووە . هەر کە چووە ناو شانەی زیندوو گیانی دێتە بەر و چالاك ئەبێ. وەك لە سەرەوە دەرکەوت، ئەم وشانەش لە دەرەوەی رستەدا مردوون هیچ دەور و چەمکێکیان نییە، لە ناو رستەکاندا گیانیان دێتە بەر. بۆ ئەم جۆرە کەرەسانە ( وشەی ڤایرۆسی ) م پێشنیار کردووە[1].

یاساکەی بەم جۆرەیە: وشە دووبارە ئەکرێتەوە بە جێگیرکردنی دەنگی یەکەم لە وشەی دووەمدا بە (م) و بە ئامرازی بەستن (و) وشەکان لێك ئەدرێن .

هەر وشەیێ بە (م) دەست پێ نەکات بەر ئەم یاسایە ناکەوێت. لەگەڵ ئەو وشانەی بە (م) دەست پێ ئەکەن ، ئەو چەمکە واتاییانە بەکەڵۆکێشن **collocation** دەرئەبڕێن وەك ( مێش و مەگەز – مار و مێروو).

ئەم جۆرە دارشتنانە جۆرێکن لەو جووتە وشانەی بە ( جووشە[٢] Reduplication ) ناو ئەبرێن. شیکردنەوە و لێکۆڵینەوەی ئەم لایەنەی زمان ئەبێ بە سێ ئاستی شیکردنەوە ( فۆنۆلۆجی و مورفۆلۆجی و پراگماتیکی ) ئەنجام بدرێ. ئەم دیاردەیە لە زۆربەی زمانەکاندا هەیە. لە رووی دارشتنەوە لە زمانی کوردیدا بەلای کەمی سێ جۆری لێ دەستنیشان ئەکرێ:

١ – تەواو : وشەکە بە تەواوی دووبارە ئەکرێتەوە وەك ( کانییەکە **پڕپڕ** بوو).

٢ – دووبارەکردنەوە بە گۆڕینی دەنگ: وشەکە دووبارە ئەکرێتەوە بە گۆڕینی دەنگێ یا زیاتر بە دەنگیی تر، وەك ( زۆر یارمەتیی **برادەر و مرادەری** خۆی ئەدات.)

٣ – دووبارەکردنەوە بە هۆی ئامراز ( **ساڵ بە ساڵ** خۆزگەم بە پار.)

لە زمانی کوردیدا گەلێ جۆر ( جووشە ) هەن و هەر جۆرەش چەمکی سیمانتیکیی تایبەتیی خۆی و یاسای خۆی هەیە بۆ دارشتنی. ئەمانە بەشێکیانە:

**١ – ( ئاوەڵناو + ئاوەڵناو )**

**أ – ( ئەگەر هێز لەسەر وشەی یەکەم توند کرا ) واتای ئێجگار و زۆر و بەتەواوی ئەگەیێنێ :**

**پیر پیر** : ئێجگار پیر ( تا پیرپیر نەبوو نەمرد)

**تێرتێر** :  ئێجگار/ زۆر تێر  ( تێر تێرم خوارد )

**پڕ پڕ** : بەتەواوی ( دوێنێ ئەم وەختە کانییەکە پڕ پڕ بوو )

**ب – ( ئەگەر هێز لەسەر هەردوو وشەکەدا یەکسان بوو)  هەڵبژاردنی جۆر و جیا کردنەوە.**

**درشت درشت** : هی درشت درشت هەڵبژێرە.

**گەورە گەورە** : قسەی گەورە گەورەی کرد

**گەش گەش** : ئەستێرەی ( گەش گەش)مان ئەژمارد.

**٢ – ( ناو + و +  ناو ) واتای فراوانکردنی واتایی و گرتنەوەی شتی تر:**

کەر و مەر – دار و مار – گوڵ و موڵ – ڕێ و مێ

ئەم یاسایە ئەو وشانە ناگرێتەوە کە بە (م) دەست پێ ئەکەن وەك ( مەڕ – ماسی – مانگ )

**٣ – ( شوێن + شوێن + ـەوە ) واتا ئەوپەڕی شوێنەکە:**

پێش پێشەوە – پشت پشتەوە – سەر سەرەوە .

لە پێش پێشەوە دانیشتبووین.

**٤ – ( شوێن + او + شوێن ) چەمکی جۆری گوێزانەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێ:**

پشتاوپشت – دەشتاودەشت – تەنیشتاو تەنیشت – دۆڵاو دۆڵ – شاراوشار – دەستاو دەست –  دەماو دەم – تووناوتوون.

**٥ – (ناوی کات +  ناوی کات)  هەر خولەی جارێك . ئەم داڕشتنانەی هەیە:**

**أ –   (ناوی کات +  ناوی کات)**

ساڵ ساڵ – مانگ مانگ – حەفتە حەفتە – ناوە ناوە

حەفتە حەفتە ئەیبینم.

ناوە ناوە بیرەوەرییەکانی خۆی بۆ ئەگێڕامەوە.

**ب – (ناوی کات + ـە و ناوی کات)**

سالّە و سالّ – مانگە و مانگ – حەفتەو حەفتە

سالّە و سالّ دەرئەکەوێ.

**ج – (ناوی کات + بە ناوی کات)**

سالّە بە سالّ – مانگ بە مانگ – حەفتە بە حەفتە

مانگ بە مانگ کرێکەی بۆ ئەبەم.

**د – (ناوی کات + نا ناوی کات)**

سالّە نا سالّ – مانگە نا مانگ – حەفتە نا حەفتە

بەری ئەم درەختە سالّ نا سالّ باش ئەبێ.

**٦ – ( ناوی سروشتی + ـە ناوی سروشتی ) ئەنۆمەتۆپیا**

قیژە قیژ – زیکە زیك – نالّە نالّ

**٧ – جۆر و شێوەی ئەنجامدان ( ئاوەلّکار)**

بەرەبەرە – وردە وردە – ناوە ناوە – توند توند – زوو زوو

وەکو سوورایی خۆرنشین (بەرەبەرە) توایەوە.

دەم و چاومان پاك پاك ئەشۆین

( وردە وردە ) نانمان ئەخۆین

**٨ – ( ژمارە + ژمارە ) دەستە و کۆمەلّ و بەشداری:**

یەك یەك – دوو دوو – هەزار هەزار – پۆل پۆل – دانە دانە – کەم کەم

با قوتابییەکان دوو دوو ریز بن.

**٩ – ( ناو + ناو ) خەسلّەت و شێوە.**

کون کون – لەت لەت

گولله ئوتومبیلەكەی كون كون كردبوو.

ئەی ئەو دڵەی ئیمڕۆ لەت لەتی.

**١٠ – جگە لەمانە زۆر جووشە لە زمانی کوردیدا هەن کە ئەکەونە خانەی چەن جۆرێکی تێکئاڵاو و چووەناو یەکەوە وەك:**

تاو تاو / تك تك / ئەنجن ئەنجن / هەرگیزاوهەرگیز / ناخی ناخ / هەلا بە هەلا / فلس فلس / بست بست / دەنك دەنك / هەنگاو بە هەنگاو / بن بنەوە / سەرسەر/ سەرسەرەوە / رەنگاوڕەنگ / کەل و پەل / هەلا بە هەلا / هەرچی و پەرچی / پەڕ پەڕ / جگ جگانێ/بەرە بەرە/ تۆپ تۆپانێ/ کە چوو چوو / پیاوە پیاو/ ...هتد.

ئەم دیاردەیە لە زۆربەی زمانانی جیهان هەیە.

## پەراوێز

١ – بۆ ئەم جۆرە کەرەسانە ( وشەی ڤایرۆسی ) م پێشنیار کردووە.( سەیری سەرچاوە ژمارە ١ بکە).

**ڤایرۆس** ئەندامیکی یەکجار بچووکی مایکرۆسکۆبییە لە ناو شانەی زیندوودا ئەژیێ. سادەترین و بچووکترین شێوەی ژیانن ، هۆی سەرەکیی زۆر نەخۆشین. سۆریژە و ئاوڵە و پەسیوی و هەڵامەت و زۆر نەخۆشیی کوشندەی تر ڤایرۆسین. هەندێ ڤایرۆس پەلاماری رووەك و ئاژەڵ ئەدەن هەشە پەلاماری بەکتریا ئەدەن. ڤایرۆس ئەبێتە هۆی تەنچەوتی بە تێکدان و داڕزاندنی شانە زیندووەکان. جۆرە ڤایرۆسی واش هەن بێ ئەزیەتن. خەسڵەتی سەرەکیی ڤایرۆس ئەوەیە کە بووەرێکی هەم زیندووە هەم مردوو. گەر لەدەرەوەی شانەدا بێ ، مردووە ، هەرگیز زیاد ناکات. کە دەچێتە ناو شانەی زیندووەوە ژیانی دێتە بەر و چالاك ئەبێ و ئەکەوێتە زیادکردن.

ڤایرۆس لە ساڵی ١٨٩٨دا لە لایەن زانای هۆڵەندی (مارتینۆس بێیجیرێنك) دۆزراوەتەوە. هەر ئەم ناوی نا ( ڤایرۆس ) کە وشەیێکی لاتینییە واتای ( ژەهر ) ئەگەیێنێ.

٢ – زاراوەی ( جووشە) بە پێڕەوی Blending ( ئاوێتە) داڕێژراوە . جۆرێکە لە وشەی لێکدراو. لە وشەی لێکدراودا دوو وشە بە یاسا لێك ئەدرێن. لەم جۆرە لێکدانە دوو وشە لێك ئەدرێن دوای پاچینی نیوەی دووەمی یا بەشێکی وشەی یەکەم و نیوەی یەکەمی یا بەشێکی وشەی دووەم .(جووشە) بەم پێڕەوە لە ( جووتە + وشە) وەرگیراوە بە لابردنی (تە) ی جووتە و ( و ) ی ( وشە) .

**سەرچاوەکان**

١ – **وریا عمر أمین** ( ١٩٩٠ ) جووتە وشە . ڕۆژنامەی هاوکاری ژمارە ١١٧٠ی ١٩٩٠/٤/١٦.

٢ ـ ( ٢٠٠٤) ئاسۆییێکی تری زمانەوانی . هەولێر . ئاراس.

**3 – Amin, W.O**.(1979) Aspects of the verbal construction in Kurdish. M.Phil thesis presented to the University of London, SOAS.

**4 - Crystal, D**. (1989) The Cambridge Encyclopedia of Language. Cambridge University Press.

**5 – Fatah, M.M.** (2002) Reduplication. Zanko V.

**6-Katamba, F.** (1993) Morphology. London.

**7–Matthews,P.H**.(1974) Morphology. Cambridge University Press.

**8–Robins, R. H.** (1980) General Linguistics: An Introductory Survey. 3rd edn.
Longman.

## *الخلاصة*

**أ. د. وريا عمر أمين**

التكرار عملية لغوية بواسطتها تتكرر وحدة لغوية كالـ ( كلمة – مقطع ..الخ) لصياغة كلمات جديدة للتعبير عن مفاهيم أخرى أو قاعدة لغوية. توجد هذه الظاهرة في العديد من اللغات.

تستخدم اللغة الكردية حالة التكرار على نطاق واسع للتعبير عن مفاهيم كالتأكيد والتحديد ..الخ. توجد فى اللغة الكردية ثلاثة انواع من التكرار:

١ – التكرار التام.

٢ – التكرار الجزئي.

٣ – التكرار بأداة.

هذا البحث محاولة لتفسير أحد جوانب هذه الظاهرة في اللغة الكردية.

# *Abstract*

# Reduplication in Kurdish

**Professor Dr. Waria Omar Amin**


Reduplication is a morphological process by which a linguistic unit is repeated. It is found in a wide range of languages through out the world. It is used both in lexical derivation to create new words and in inflection to convey a grammatical function.. Reduplication may be complete or partial . Kurdish uses reduplication extensively for word-formation to produce such concepts as, emphasis, intensity, continuity, …etc. . When the entire base is reduplicated, a special kind of compound reduplication is produced. Two types of complete reduplication can be recognized: proper reduplicated compounds and superadded ones, where a functional free or bound morpheme is added to the base or reduplicated item.

In this paper the reduplicated forms in Kurdish are described, classified and some of their rules are briefly specified.

# زانكۆ و توێژینەوەی زانستی

**د٠ قادر محەممەد پشدەری**

زانكۆی سەلاحەدین / كۆلێژی ئاداب ـ بەشی مێژوو

## پێشەكی

توێژینەوەی زانستی، لایەنی هەرە دیارو گرینگی كاری ئەكادیمی نێو زانكۆ و پەیمانگا زانستییەكانە، چالاكی و كارایی مامۆستایان و توێژەرانی نێو زانكۆ و پەیمانگاكان دەردەخاو رۆلێكی بەرچاو لە پەرەسەندنی كایەی رۆشنبیری و گەشەدان بە پێشكەوتن و بالأدەستكردنی مەعریفە لە كۆمەلگادا دەگێرێ ، بۆیە زانكۆ و دامەزراوە زانستییەكان ، لە رێگای كاراتر كردنی بواری توێژینەوەی زانستی و هاندان و برەودان بە خوێندنی بالأ ، هەمیشە لە هەلپەی هەلكشاندنی ئاستی زانستی خۆیانن ٠

ئەم سەردەمەی ئێمەی تێدا دەژین، گۆرانكاری گەورەی لە بوارە جیاجیاكانی ژیان هێناوەتە گۆرێ و خوێندن و فێركردن یەك لەو بوارانەیە، كە كارتێكردن و كارلێكردنی لە نێو چوارچێوەی ئەو پەرەسەندنانەدا بەخۆوە بینیوە، بۆیە توێژینەوەی زانستی و خوێندنی بالأ لە بەردەم جیهانبینی و ستراتیژ و ئەركی نوێدا خۆیان دەبیننەوەو لە جاران زیاتر، رۆلیان لە پرۆسەی پێشكەوتن و شرۆڤەكردن و بەرهەمهێنانی مەعریفە لێ چاوەروان دەكرێ و سوود و بەهرەی توێژینەوەی ئەكادیمی، لە دونیای ئەمرۆدا، كونج و ئاقارە جیاجیاكانی ژیانی گرتۆتەوە ٠

بۆ پـەیبردن بـە بـەهاو گرینگـی توێژینـەوەی زانـستی و وابەسـتەیەکانی بـەژیانی ئـەکادیمی نێـو زانکـۆ و پـەیمانگاکان و ئەنگوسـت خـستنە سـەر ئاستەنگەکانی لە نێو زانکۆکـانی کوردسـتاندا و چۆنایەتی پـەرەدان و پیتـە پێدانی ئەو بوارە و چالاککردن و چاکسازی کـردن تێیـدا، بـە باشمـان زانـی توێژینەوەی لە سەر بکەین .

توێژینەوەکە لە چوار تەوەرە پێك دێت: تەوەرەی یەکەم تەرخان کراوە بـۆ ڕوونکردنەوە و دەرخستنی پێگەو بەهای توێژینەوە زانستی و گرینگی لە نێو کایەی ئەکادیمی زانکـۆ و پەیمانگاکانـدا، لـە تـەوەری دووەمـدا ئاسـتەنگ و گرفتەکانی کاری توێژینەوەی زانستی باس کراون و لە گۆشە نیگایەکی هەمە لایەنانەوە هەوڵ دراوە دیارترین و زەقترین کۆسپەکانی دەستنیشان بکرێن .

تەوەری سێیەم تایبەتە بـە دیـاریکردنی ئـەو شـێواز و میکانیزمانـەی کـە دەشـێ بەهۆیانـەوە چاکـسازی لـە بوارەکـەدا بکـرێ و گەشـە بـە بـواری لێکۆڵینەوەی زانستی بدرێ .

بەڵام تەوەری چوارەم بریتییە لە تێڕوانینێکـی ئایندەییانـە بـۆ داهـاتووی کاری توێژینەوەی زانستی و ئـەرکی زانکۆکـان و خوێندنەوەیـەکی سەرچـاوە گرتـوو لـە مێـژووی ژیـانی ئـەکادیمی، بـۆ پـەیبردن بـە سـبەینێی زانکـۆ و دامەزراوە زانستییەکان و ڕۆڵیان لە کۆمەڵگادا .

## تەوەری یەکەم

## پێگەو گرینگی توێژینەوەی زانستی

یەك لە پایە هەرە سەرەکییەکانی فێرکردنی باڵا و کاری زانکـۆیی بریتییـە لە توێژینەوەی زانستی و کارکردن لە بـواری لێکۆڵینـەوەی ئـەکادیمی، هـەتا وای لێهاتووە، کە زانکۆکان ، بـە چـەندایەتی و چـلۆنایەتی ئـەو توێژینەوانـە

هەڵدەسـەنگێنرێن کـە مامۆسـتایان و توێـژەرانی ئـەنجامی دەدەن و بـڵاوی دەکەنەوە. هەندێك لە زانکۆ جیهانییـەکان دەسـتبەرداری ئـەو مامۆسـتایانە دەبن کە لە ماوەی خزمەتکردنیان توێژینەوەی زانستی فەرامۆش دەکەن [١].
هەرچەندە توێژینەوەی زانستی لەگەڵ زانکۆکاندا فراژو بووە ، بەڵام لە دوای جـەنگی جیهـانی دووەمـەوە گرینگییەکـەی زیـادی کـردووە ، ئەمـەش زیـاتر دەگەڕێتەوە بۆ باڵادەستبوونی چـەمکی کـەلتووری توێژینـەوە( culture of research ) لە ئەمریکا و هەندێك دەوڵەتانی دیکەی دنیادا نەخاسمـە دوای کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانی[٢] .

هەر لەبەر ئەوەشە، توێژینەوە بە بنچینەی خوێندنی باڵا دانراوە، چـونکە ئامانجی توێژینەوە، گەیشتنە بەڕاستی لە بـوار و پـسپۆری جیاجیـادا. بۆیـە هەتا هەندێك لە پسپۆران ، بە بناغەی ئازادیان داناوە و بـەڵکو بـە پێویـست زانـراوە هـەموو ئـەکادیمییان لـە هـەمان کاتـدا توێـژەریش بـن[٣] ، چـونکە توێژینــەوە وێــڕای وانــە گوتنــەوەو خزمــەتی کۆمــەڵگا، ئــەرکی ســەرەکی ئەکادیمییانی نێو زانکۆ و پەیمانگاکانە کە بەهۆیەوە ڕۆڵیان لە بەرهەمهێنان و پەرەپێـدان بـە مەعریفـە وازی دەکـەن و کاریگـەری بەرچـاویان بەسـەر پێشکەوتنی کۆمەڵگاوە دەبێ.[٤]

ئەو بەرئەنجام و بـەهرە تیـۆری و پڕاکتیکییانـەی کـە لـە توێژینـەوەکان دەکەونەوە، پێگەو جێگەیەکی دیاریان دەبێ و ناوبانگ بۆ زانکۆکان مسۆگەر دەکەن ، بۆیـە بـەپێی ڕای هەنـدێك لـە لێکۆڵـەران زانکـۆ بـەبێ توێژینـەوەی زانـستی نـابێ[٥] بـوون و مانـەوەو کـارای زانکـۆ بەنـدە بـە چـۆنیەتی ئـەو توێژینەوانـەی توێـژەرەکان ئـەنجامی دەدەن و بـەو هۆیـەوە بەشـێوەیەك لەشێوەکان کاریگەری بە سەر کۆمەڵگاوە دادەنێن.

لــە ســەردەمی نوێــدا، توێژینــەوەی زانــستی، لەبــەردەم گــۆڕان و پێــشڤەچوونی زۆردایــە و کاریگــەری بەســەر کۆمــەڵگای مرۆییــەوە هەیــە ٠ دانیشتوانی سەرزەمین لـەنێو پێـشکەوتن و خۆشـگوزەرانی و باڵادەسـتی لـە لایەك و دواکەوتن و دەستەوسانی و بێ بڕستی لە لایەکی دیکە دابەش بوون، کە زۆر ڕوونە، هۆکـاری یەکلاکـەرەوە لـە پـۆلێنکردنی ژیـان و ئاینـدەی هـەر میللەتێك دەکەوێتە سـەر ڕادەی پێـشکەوتن و ژیـاری ئـەو میللەتـە بـە هـۆی توێژینــەوە و سـوودمەندبوون لێـی[٦] ئـەو پرۆسـەیە و یەکاڵابوونـەوەی ڕۆڵـی زانکۆکان لەو بوارەدا گرنگی کۆمەڵایەتی توێـژەرانی هەڵکشاندووە و بزاوتـی زانستی لە کۆسپ و تەگەرە ڕۆشـنبیری و کەلتوورییـەکان ڕاپـسکاندووەو لـە سـەردەمی گـۆڕین زیـاتر شـوێنی توێژینـەوەی زانـستی و کاریگـەری بەسـەر تاکەکانی چەسپاندووە[٧].

هەرچەندە توێژینــەوەی زانـستی زۆرتـر هـەم وەکـو بابـەت و هـەم وەکـو پەیڕەو دەرکەوتووی نێـو شارسـتانی ڕۆژئاوایـە، بـەڵام وڵاتـانی گەشـەکردوو وەکو وڵاتی ئێمەش گرنگییان پێداوە، لەگەڵ دەرکەوتنی زانکۆکاندا لـەبواری جیاجیای توێژینەوەی زانستیدا هەنگاویان ناوە و هەرچـەندە ئـەو گرنگیدانـە لەئاستی پێویستییەکانی کۆمەڵگادا نەبووە و لەچاو وڵاتانی پێـشکەوتوو زۆر کەم و لاواز بووە،[٨] بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سروشتی لێکۆڵینـەوەی زانـستی و جۆرەکانی و ڕەهەندە جیاجیاکانی لە دنیای ئەمڕۆماندا بەبەردەوامی قـسە و باسیان لەسەر دەکرێ و ئاقارەکانی مشتومالْ و پۆلێن دەکرێن٠[٩]

سەرەڕای هەموو ئەو گرنگیدان و بایەخە کە توێژینەوەی زانستی هەیەتی، بــەڵام هــەتا ئێــستاش لــە وڵاتــی ئێمــەدا کــاری توێژینــەوەی ئــەکادیمی نەنرخێندراوە جگە لە زانکۆ و پەیمانگاکان، دامەزراوەی ئـەکادیمی دیکـەمان

نین کە توێژینەوەی زانستییان لێ ئەنجام بدرێ و ئەوەی لە زانکۆکانیش بەڕێوە دەچێ، چونکە بەشی زۆریان بە ئامانجی توێژینەوەی زانستی بەهرەمەند بوون لەئەنجام و ڕاسپاردەکان نەنووسراون، بەڵکو زیاتر وەکو ئەرکێك بۆ وەرگرتنی بڕوانامە یان بەرزبوونەوەی پلەی زانستی یان لەسەر داوای لایەنێك یان گۆڤارێك....هتد نووسراون و ئەمەش ئەوەندەی توێژینەوەی زانستی کردۆتە ئامانجێکی کاتی یان هۆکارێك بۆ دەستکەوتێکی ڕاستەوخۆ ئەوەندە نەیکردۆتە بوارێك بۆ خوێندنەوەی خود و بەرهەمهێنانی زانین و جیهانبینی نوێ و بنیادنانی مرۆڤی ئاییندە.

## بەشی دووەم

## ئاستەنگەکانی بەردەم پەرەدان بە توێژینەوەی زانستی

هەر توێژەرێك, بارودۆخی توێژینەوەی زانستی لە زانکۆ و دامەزراوە ئەکادیمییەکانی عێراق و کوردستان، بخاتە ژێر تیشکی لێکۆڵینەوەی وردەوە، هەر زوو دەرك بەوە دەکات، کە ئاستی چەندایەتی و چۆنایەتی توێژینەوەی زانستی گیرۆدەی گرفت و ئاستەنگ و کۆسپی جۆراوجۆرە، هەرئەمەش وای کردووە کە باری توێژینەوەی زانستی بەو حاڵەی ئێستا بێت، دیارترین هۆکارەکانی ئەو لاوازیی و لەدوایدانەی کە تەگەرەی بەردەم پێشکەوتنی بواری توێژینەوەی زانستین دەکرێ بەم شێوەیەی خوارەوە دیاریان بکەین:

- دیارترین کۆسپی سەرەکی گەشەکردنی توێژینەوەی زانستی کەمی پاڵپشتی مادی و بێ نموودی ئەو بودجەیەیە کە بۆی خەرج دەکرێ[١٠] ، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە کاری توێژینەوە هەتا ئێستا وەکو

پرۆسـەیەکی بەرهەمـدار و بەبایـەخ تەماشـا نـاکرێ و بەتـەنیا، پێگەیـەکی شایستەی بۆ دیاری نەکراوە ، ئەمەش پەتایەکە، زۆربەی وڵاتانی وەکو وڵاتی ئێمەی گرتۆتـەوە[11] توێژینـەوە، کـە دەبـێ بابەتییانـە و بـێ گـرێ و گـۆڵ و رێکوپێك بێ و بەرەنجامی بەربڕشـتی هـەبێ[12] ، بـەبێ پـارە نـاکرێ. کـەمی پاڵپـشتی دارایـی هـەر لـەوە ئاسـتەنگ نییـە کـە پـارەی پێویـست بـۆ توێژینـــەوەکان خـــەرج نـــاکرێ و توێـــژەران نـــاتوانن بەتـــەواوی کـــاری قووڵبوونەوەی ئەکادیمییانەی خۆیان بەجێ بگەیەنن، بەڵکو لـەوە بەسـوێتر، ئەوەیـە، کـە گیـانی توێژینـەوە و هـەڵوەدابوون و گـەڕان بـەدوای راسـتییە زانـستییەکان و لێکۆڵینـەوە لـە گرفتـەکان لـەلای توێـژەران دەکـوژێ و ڕێ دەگرێ لە باڵادەست بوونی کەلتووری توێژینەوە.

● کـەمی یـان نـەبوونی دامـەزراوەی تایبـەت بـە توێژینـەوەی زانـستی فاکتەرێکـە لـە دروسـت نـەبوون و فۆرمەلەنـەبوونی کەسـایەتی تایبـەت و سـەربەخۆ بـۆ توێژینـەوەی زانـستی ڕۆڵـی هەیـە، هەرچـەندە وا زانـراوە کـە زانکۆکـان شـوێنی سروشـتی ئەنجامـدانی توێژینـەوەی زانـستین[13]، بـەڵام لەدنیای پێشکەوتن و گەشەکردووی ئەمڕۆدا، بوونی دامـەزراوەی تایبـەت بـە توێژینەوە زۆر پێویستن و لە ئـەوروپا و ئەمـەریکا هـەر لـە دوای تـەواوبوونی جەنگی دووەمی جیهانی، بەرەبەرە دام ودەزگای تایبەت دروست بوون و لـە دەرەوەی زانکۆکان کاری توێژینەوەیان بەئـەنجام دەگەیانـد[14] لـە وڵاتـانی سوشیالیستی پێشوودا چەندان دامەزراوە و پـەیمانگای توێژینـەوەی تایبـەت بۆ بەرنامەڕێژی ئەکادیمی و لێکۆڵینەوەی زانستی دامەزرابوون[15] ئێستا زۆر لـەجاران زیـاتر ئـەو مەسـەلەیە بەهەنـد وەردەگـیرێ و لەگـەڵ پەرەسـەندنی تەکنەلۆجیا و کرانەوەی دنیادا ئـەو بـوارەش گەشـەکردنی بـەخۆوە بینیـوە،

نەبوونی مەڵبەند و دامەزراوەی جیاجیای توێژینەوە کۆسپن لەبەردەم ئەو گرنگیدانە فراوانە ئاسۆیی و ستوونییەی کە دەبێ بۆ خزمەتکردنی کۆمەڵگا لە ڕێگای توێژینەوەی زانستییەوە هەبێ.

● نەبوونی پلانی شایستە و تایبەت لە زانکۆ و دامەزراوە ئەکادیمییەکان بۆ بەرنامەڕێژی کردن و نەخشەدانانی زانستییانەی بۆ پەرەدان بە توێژینەوەی زانستی و هەوڵدان بۆ کۆکردنەوەی تواناکان وئاراستەکردنیان بەشێوەیەك کە سەربەخۆیی ئەکادیمییانە بۆ توێژینەوەکان فەراهەم بکات و لە هەمان کاتدا ، بەرنامەکاری توێژینەوە هەبێ و هێڵە گشتییەکانی ئەو بابەت و دیاردە و گرفتانە دیاری کرابێ و پێش وەختە توێژەرانی لێ ئاگادار بکرێتەوە ، نەبوونی پلانێکی گشتی لەم چەشنە ، وای کردووە کاری توێژینەوەی زانکۆکان، هەم کەسی بێ و هەمیش سنووردار و بێ بەرنامە . ئەمەش دیسان پرۆسەی توێژینەوەی پەراوێز خستووە و وکو کارێکی ڕێکخراو و بە بەرنامە دەری نەخستووە.

● کەمی کات و دەرفەتی مامۆستایان بۆ ئەنجامدانی توێژینەوە، چونکە مامۆستایان کاتێکی زۆری خۆیان بە وانەگوتنەوە بەسەردەبەن و وەکو پێویست نایانپەرژێتە سەر کاری توێژینەوە و ئەمەش کۆسپێکە کە جۆرێك لە ململانێی لەناو دام و دەزگا ئەکادیمییەکاندا لێ دروست بووە[١٦] ئەمە لەزۆربەی زۆری زانکۆکانی دنیادا هەیە و لە وڵاتێکی وەکو ئەمەریکادا بەشێکی زۆری کاتی پرۆفیسۆرەکان بە وانەگوتنەوە بەسەر دەبرێت،[١٧] لە بەر ئەوەی کاتی سەرەکی مامۆستایانی زانکۆ بۆ وانە گوتنەوە تەرخان دەکرێت ، بۆیە ئەو پێو دانگانەی کە بەهۆیانەوە کاری مامۆستایانی زانکۆ هەڵدەسەنگێنرێت پلەی زانستییان — بە توێژینەوە — پێ بەرز دەبێتەوە

کۆك و تەبا نییە لەگەڵ ئەو ئەرکە سەرەکییەی — وانەگوتنەوە— کە بۆیان داندراوە [١٨] بەڵام ئێستا لە وڵاتی ئێمەدا خەریکە وانەگوتنەوەی زانکۆیی وەکو کاری هەرە سەرەکی یان هەندێ جار تاقانەی مامۆستایانی زانکۆ دەبێتە کەلتوورێك و وای کردووە توێژینەوەی زانستی بەکارێکی لاوەکی دابنرێت و گەر لەبەر پێداویستییەکانی بەرزکرانەوەی پلەی زانستی نەبێ ، بەشێکی زۆری مامۆستایان کاری توێژینەوە ناکەن و ئەمەش چالاکی و ڕۆڵی وانی تەنیا لە چوارچێوەی تەسکی فێرکردن هێشتۆتەوە ئەوانی لە ئەکادیمییەکی توێژەر، نووسەر، بیریار شۆردووە، ئەمەش مەترسی ئەوەی لێ دەکرێ، کە زانکۆکان ڕۆڵی سروشتی خۆیان لە کۆمەڵگادا نەگێڕن، چونکە توێژینەوەی زانستی کات و خۆ بۆ تەرخانکردنی دەوێ و گەڕان و هەوڵدانی گەرەکە و بەبێ بزاوت و ماوە و مانەوە لە مەیدانی توێژینەوەو تاقیگە و ناو کتێبخانە پێك نایەت.

- نەبوونی کەشێکی زانستییانەی لەبارو هەلومەرجێکی ئەکادیمی گونجاو کە وابکا توێژەران بەئاسانی بتوانن لەژێر سایەیدا کاری لێکۆڵینەوە و گەڕان و ڕاگۆڕینەوە و هاوکاری زانستی بکەن و ڕێگری بیرۆکراتی و دەست تەنگیان نەبێ و لە چوارچێوەی سیستەمێکی بەحورمەتی سەربەخۆیی ئەکادیمیدا پەرە بەتوێژینەوەکانیان بدەن
- لە زانکۆکانی ئێمەدا، لەبەر لاوازی پێگەی توێژینەوە. ئەو لا لێکردنەوە نەکراوە کە بەهۆیەوە ، هەلومەرجێك بۆ پێکهێنانی کەشێکی ئەکادیمی ئازاد بڕەخسێ. مامۆستایان و توێژەرانی هاوپسپۆڕیی دیدارو بەیەکگەیشتنی هزری و زانستییان بۆ نارەخسێ و هەریەکە بۆخۆی کاری توێژینەوەکانی دەکاو هاوڕێ و هاوکوفە زانستییەکانی ئاگایان لێ نییە و ئەمەش وادەکا

کاری توێژینەوەی زانستی سست و پچرپچڕ بێ و ئەو بارودۆخە نەیەتە ئاراوە کە توێژەر بتوانێ پلان و بەرەنجامەکانی توێژینەوەکانی بگەینێتە ئەوانی دیکەو بە گەیاندنی دەروونی ئاسوودە بکا و هەروەها بە گفتوگۆ و بۆچوونی بەرامبەرەکانی دەوڵەمەندیان بکاو پەرەیان پێ بدات[١٩]. هۆکارەکانی نەبوونی ئەو هەلو مەرج و کەشە زانستییە زۆرتر پەیوەند بەنەبوونی ترادیسیۆنی ئەکادیمییانە و بەهرەمەند نەبوون لە توێژینەوەی زانستی و سستی دام و دەزگا کارگێڕییە ئەکادیمییەکان لە نەهێنانە گۆڕی کەشێکی ئاوادا[٢٠]، کە بێگومان کاریگەری خراپی هەیە لەسەر ڕاستەڕێی نەبوونی کاری توێژینەوە لەژیانی ئەکادیمییانەی ئێمەدا و هەروەها پەرش و بڵاوی و ناڕێکی ئەو گرفت و بابەت و مەسەلانەی کە توێژینەوەیان لەسەر دەکرێ.

● ئەم حاڵە دەکرێ بیبەستینەوە بە مەسەلەیەکی دیکە، ئەویش گرفتی نەبوونی سیاسەتێکی نیشتیمانییانە بۆ توێژینەوەی زانستی، ئەو سیاسەتەی کە ڕێکخراوی یونسکۆ پێناسەی کردووە بەوەی کە( کۆمەڵێك ڕێنمایی گشتی و تەگبیرو ڕێکخستنی ڕێکوپێکە کەوا وڵاتێك پەنایان بۆ دەباو دەیانگرێتە بەر لەپێناوی بەدیهێنانی پێشکەوتنی زانستی گونجاو و کۆك لەگەڵ هەلومەرجی ڕۆشنبیری و سیاسی و ئابووری خۆیدا)[٢١] نەبوونی سیاسەتێکی لەم شێوەیە کە دەوڵەت ئاڕاستەی بکات ، وادەکات کە بێ بەرنامەیی هەبێ و کاری توێژینەوە لە نێو چوارچێوەیەکی ستراتیژی میللییانەی هاوبەشدا فۆرمەلە نەکرێ و فەلسەفەی دەوڵەت بۆ پەرەدان بە توێژینەوەی زانستی هیچ ڕۆڵێك نەگێڕێ و توێژینەوەی زانستیش بۆ سەقامگیربوونی سیاسەتێکی لەو شێوازە گرنگییەکی وای نەبێ و نەبەسترێتەوە بە پرۆژە کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسییەکان و گەشەکردووتریان نەکات.

• گرفتێکی دیکەی توێژینەوەی زانستی، بێ ئومێدی توێژەرانە لـەوەی کـە توێژینەوەکانیان هەر لەچوارچێوەی تەسکی ئەکادیمیدا دەناسرێ و مامەڵەی لەگـەڵ دەکـرێ و زۆرکـەم ڕێـك کـەوتووە لـە پـرۆژە و کـارە ڕۆشـنبیری و کۆمەڵایـەتی و ئـابووری و سیاسـییەکانی وڵاتـدا سـوود لـە توێژینـەوەی ئەکادیمییەکان وەربگـیرێ (نموونـەی جـۆراو جـۆر لـەو بـوارەدا لـە سـەرجەم بەشە جیاجیاکانی زانکۆکاندا هەن ، لەبەر زۆرییان لێرە جێیان نابێتـەوە ) ٠ ئەمـەش دەمانباتـە سـەر مەسـەلەی پەیوەنـدی نێـوان زانکـۆ و کۆمـەڵگاو دامەزراوە حکومییەکان – کە نامانەوێ لەم باسەدا لەسەری بـڕۆین– بـەڵام دیـسان، ئـەو بابەتـە هەڵـدەگرێ تـاوتوێ بکـرێ و لـە هۆکارەکـانی بەردەوامبوونی بکۆڵدرێتەوە، لـە زۆربـەی زۆری بەشـە زانـستییەکانی زانکـۆ جیاجیاکانی کوردستان چ لەلایـەن مامۆسـتایانەوە یـان قوتابیـانی خوێنـدنی باڵا، توێژینەوە و تێزی وا بەرهەم هاتوون، کە لە بوارە بەرفراوانەکانی ژیاندا، دەشـێ سـوودیان لێ وەربگـیرێ. بـەڵام وەکـو پێویـست نەخراونەتـە واری جێبەجێکردنەوە، بۆیە نەبوونی دیدێکی پراگماتییانە بۆ توێژینەوەی زانستی و بەکارنـەهێنانی لـە پێشخـستن و باشـترکردنی کۆمـەڵگا و بەرزکردنـەوەی ئاستی هزری و جیهانبینی تاکـەکان، وای کـردووە، زۆربـەی توێـژەران، هـەر بـەئامانجی وەرگرتنـی بڕوانامـەی بـاڵاو بەرزکردنـەوەی پلـەی زانـستییان ، توێژینـەوە بکـەن، توێژینـەوەکانیش، لـە چوارچـێوەی تەسـکی ئەکادیمیـدا بەفەرامۆشکراوی و پووش بەسەرکراوی بمێننەوە .

• کەمی سەرچاوەی زانستی و تاقیگە و پێداویستی– کەرەستەی خـاوی– توێژینـەوە، یـەك لـەو کۆسـپانەیە کـە هـەم وا دەکـا بـوار و پانتاییـەکانی توێژینـەوەی بـچووك و هـەم لـەنێو بوارەکەشـدا جۆرێـك لـە دەسـت تـەنگی

مەعریفی بۆ توێژەر دروست دەکات، کە نەتوانێ کاری توێژینەوەکە بەلەباری و دڵخوازانە ئەنجام بدات، چونکە توێـژەر گـەڕان و پـشکنینی زانـستییانەی خۆی لـەنێو تاقیگـە و کتێبخانـەدا دەسـت پێـدەکات و بـەبێ فەراهـەمکردنی پێداویستییەکانی لەو بوارەدا، ناتوانێ توێژینەوەیەکی سەرکەوتوو بنووسـێ. چـــونکە توێژینـــەوە گـــەڕانی فـــراوان و وردی دەوێ و ســـاغکردنەوە و بەدواداچوون و پەیـداکردن و هێنانـەوەی بەڵگـەی گەرەکـە[٢٢] ، کـە ئەمـەش بەبێ پاڵپشتی سەرچاوەی زانستی مەیسەر نـابێ. لـە وەختێکـدا کـە توێـژەر سەرچاوەی کەمی لەبەردەستە، بەپێی بۆ هەڵسووڕان و لوانی بڕیـار لەسـەر ئـەو بابەتـە دەدات کـە دەیکاتـە تـەوەری توێژینەوەکـەی ، نـەك بـەپێی پێداویستی زانستی و کۆمەڵایەتی یا ئابووری و سیاسی کۆمەڵگاکەی.

● تەگەرەیەکی دیکەی بەردەمی توێژینەوە لە وڵاتی ئێمەدا، ئاستەنگەکانی بڵاوکردنەوەی توێژینەوەی زانستییە، کە هەنـدێکیان تیـۆرین و پەیوەنـدییان بەمەرجـەکانی وەرگـرتن و بڵاوکردنـەوە لـە گۆڤـارە ئەکادیمییەکانـدا هەیـە کـە مـەرج نییـە هـەموویان زانـستی بـن. بەشـێکی دیکـەی کۆسـپەکانی بڵاوکردنـــەوەی توێژینـــەوە پـــراکتیکین لـــەپاش ســـپاردەی توێژینەوەکـــە بەدەســتەی نووســەران یــان ســکرتێری نووســین دەســت پێــدەکات، ئــەو پرۆسەیەی کە لەوێدا پێیدا تێدەپـەڕێ تاڕادەیـەك درێژخایـەن و ماندووکـەرە کە توێژەر تووشی ساردبوونەوە و بێ ئومێدی دەکات. هەندێك لـە توێـژەران پێیـان وایـە لەزۆربـەی وڵاتـانی ناوچـەدا ئـەو گرفتـە هەیـە، پێـوەری ڕوون و ئاشکرا و ڕێسای دیاریکراو نییە پەیوەنـدی توێـژەر بەدەسـتەی نووسـەران و ئەو پسپۆڕانەی توێژینەوەکەیان بۆ دەچێ ڕێکبخـات و هەنـدێ جـار مەسـەلە تایبەتی و کەسییەکان ڕۆڵی خۆیان دەگێڕن[٢٣] ،

## بەشی سێیەم

## چۆنیەتی پەرەدان بەتوێژینەوەی زانستی

پەرەدان و کاراترکردنی توێژینەوەی زانستی لە زانکۆکانمان پێویستییەکی زۆر گرنگە و نابێ فەرامۆش بکرێ و دەبێ هەرچی زووترە بەرنامەڕێژی و کاری بۆ بکرێ و هەوڵبدرێ ئەو لاسەنگەلی و ناهاوسەنگییەی لە ئەرکەکانی زانکۆکانماندا هەیە ڕاست بکرێنەوە و توێژینەوە و کارکردن بۆ خزمەتکردنی کۆمەڵگا وەکو کارێکی سەرەکی زانکۆکان بناسرێ و چیدی خوێندنی زانکۆیی هەر درێژەپێدەرێکی هاوشێوەی خوێندنی ئامادەییەکان نەبێ و بۆ ئەم مەبەستەش دیارترین هەنگاوەکانی پەرەدان بەتوێژینەوەی زانستی لەم چەند خاڵەدا کۆدەکەینەوە:

- بەهێزکردن و تۆکمەکردنی ژێرخانی زانکۆکان بەتەرخانکردنی بودجەی تایبەت و سەربەخۆ و باشترکردنی پاڵپشتی مادییانە بۆ کاری توێژینەوەی زانستی، چونکە پارەی خەرجکراو بۆ توێژینەوەی زانستی لە وڵاتی ئێمەدا گەر بەراورد بکرێت بە زانکۆ بەناوبانگەکانی دنیا، زۆر کەمە و هەر ئەمەش وای کردووە توێژینەوەی زانستی بایەخی پێ نەدرێ، وەکو کارێکی لاوەکی تەماشا بکرێ، بۆیە پێویستە حکومەت ئەو قەناعەتەی لە لا دروست ببێت کە گەشەپێدانی زانکۆکان و توێژینەوە تیایاندا ، دەبێتە هۆی گەشەکردنی وڵات و دەبێ دەوڵەت خزمەتگوزارییە ئەکادیمییەکان بۆ قازانجی کۆمەڵگا لە زانکۆ بکڕێتەوە [٢٤] بەمەش زانکۆ پشت ئەستوور بە پاڵپشتی داراییەوە توێژینەوەی زانستی پەرە پێدەدات. پێویستە حکومەت وا تەماشای زانکۆ و دامەزراوە ئەکادیمییەکانی نەکات کە دەزگایەکە وەکو هەموو دامەزراوەکانی دیکە و هاوشێوەکانی ئەوان مامەڵە لەگەڵ ئەرك و ڕۆڵیان بکات ، چونکە زانکۆکان پرۆسەی توێژینەوە و فێرکردن هەتا جێبەجێ کردنیشیان لێ

ئەنجام دەدرێ و لەهەموو کۆمەڵگا زانکۆ تاکە ڕێکخراوێکە سەرجەم ئەو ئەرك و کارانەی تێدا ئەنجام دەدرێ و ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە بەرەو پێشبردنی کۆمـەڵگا لەسـەرجەم بوارەکانـدا هەیـە و ئەمـەش پێگەیـەکی تاقانـە دەداتـە زانکۆکـــان[٢٥] کـــە لـــەبواری وەبـــەرهێنان و بووژانـــەوەی ئـــابووری و دەستەبەرکردنی داهاتێکی باشتر بۆ تاکەکانی کۆمـەڵگا نەخـشێکی گرنگیـان دەبێ [٢٦] و بەو پێیە زانکۆ هەر شوێنی خەرجکردن نییە بـەڵکو خەرجکردنـە لەپێناوی داهات و داهاتوویەکی گەشاوەتر بـۆ کۆمـەڵگا گـەر لـە ئایندەیـەکی دووریـش بـێ، بۆیـە دەبـێ زانکـۆ و بـواری توێژینـەوەی زانـستی بەتایبـەتی پشتیوانی زیاتری دارایی لێ بکرێ و ئەمە لە حاڵێکدا کـە چـاوەڕوان دەکـرێ، خــەرجی زانکۆکــان لــەداهاتوودا زۆر زیــاتر بێــت لەئێــستا و پێــشڕەوایەتی زانستیش بەو زانکۆیانە دەبڕێت کـە لەلایـەنی داراییـەوە پـشت ئەسـتوورن و توێژینەوەی زانستی شایستەیان لێ ئەنجام دەدرێن[٢٧].

● کردنــەوەی ناوەنـد و ئینـستیۆتی تایبــەت بەتوێژینــەوەی زانـستی لــەو بوارانەدا کە پێویستن و گرنگە سەربەزانکۆکان بن، یان لەلایەن ئەکادیمییانی زانکـۆوە سەرپەرشـتی بکـرێن، چـونکە بەوهۆیــەوە، توێژینــەوەی زانـستی بایـەخی تایبــەتی پــێ دەدرێ و توێـژەران لــەناو کەشـێکی زانـستی لــەباردا دەتوانن بۆ توێژینەوەکانیان پلانڕێژی و داتا کۆکردنەوە و تاقیکردنەوە بکەن و لە هاوکاری کـردنیش لەگـەڵ یـەکتر بەهرەمەنـدبن. لـەناو دامـەزراوەی لـەو شێوەیەدا، لیژنەی تایبەت بۆکاروباری توێژینـەوە پێکـدەهێنرێ و گرفتـەکان دەستنیشان دەکرێن و چارەسەریان بۆ دادەنرێت[٢٨]، وە لەوێدا مامۆستایانی بە ئەزموون، بەهاوکاری هەندێك لە قوتابیـەکانیان، توێژینـەوەی پێویـست و بەهادار ئەنجام دەدەن، بەو هۆیەوە ئەو دامەزراوە زانستییە دەکرێ ( ماوەی

نێوان بەرهەمهێنانی هرزەکان و گۆڕینیان بۆ پرۆژەی شیاو و بۆ جێبەجێکردنی، کورت بکاتەوە)[٢٩]. بەم شێوەیە بنکە یان ناوەندەکانی توێژینەوەی زانستی هەم لەلایەنی مادی و هەم لەلایەنی مرۆییەوە دابینکەری پێداویستییەکانی توێژینەوە دەبن و گەرم و گوڕی دەخەنە نێو کایەی ئەنجامدانی بەرهەمهێنانی ئەکادیمییانە.

- دابینکردن و فەراهەمکردنی کاتی پێویست بۆ مامۆستایانی زانکۆ لەپێناوی پەرەپێدان و شارەزابوونیان لەتوێژینەوەی زانستی و قووڵبوونەوەی تێیدا و ئەنجامدانی توێژینەوە بەبێ ئەوەی هەردوولایەنی دیکەی کاری زانکۆیی واتا وانەبێژی و خزمەتکردنی کۆمەڵگا، فەرامۆش بکرێن. هەرچەندە کاری وانەبێژی مامۆستایانی زانکۆ ئەرکێکی سەرەکی ئەکادیمییانەیانە بەڵام پێویستە لەهەمان کاتدا توێژەریش بن و ئیدی ئەو لێهاتووییەیان هەبێ کە هاوسەنگی لەنێوان هەردوو ئەرکەکەدا دروست بکەن[٣٠] چونکە ئەو مادە و بابەتانەی لەزانکۆ دەخوێندرێن بۆ خۆیان توێژینەوەی بەرفراوانن و دەشێ هەر لەڕێگای توێژینەوە دەوڵەمەند و بەپێزتر بکرێن، هەر بابەتێك لەژێر کاریگەری توێژینەوەدا مشتومالْ نەکرێ، بەمادەیەکی پرۆگرامی و زانکۆیی داناندرێت[٣١] لەبەرئەوە وای دەبینین کە هەردوو کاری وانەگوتنەوە و توێژینەوە تەواوکەری یەکترن و لایەنەکانی دیکەی کاری زانکۆیی لەبەرەنجامی کارلێکی هەردوولا و پەرەسەندنی زانکۆ و تەواوکەرییەکەی بۆ کۆمەڵگا دروست بوون[٣٢] بۆیە گەڕاندنەوەی بایەخ و شایستەیی بۆ کاری توێژینەوە پێویستی بەتەرخانکردنی کات هەیە و دەبێ مامۆستایان لەو بوارەدا بەرنامەڕێژییان بۆ بکرێ.

• دابینکردنی سەربەخۆیی ئەکادیمی زانکۆکـان و پاراسـتنی لەهـەر دەسـت تێوەردانێك، چونکە عەقڵی کارکەری زانکـۆ ڕۆشـنبیرانی ئـەکادیمین و لێیـان چـاوەڕوان دەکـرێن ئـەوان پێـشرەوی کۆمـەڵگابن، نـەك دەسـت بخرێتـە کاروباریان و لەدەرەوەی گیانی زانستی و خواسـتی خۆیـان ئاراسـتە بکـرێن. پێویستە توێژینەوەی زانستی لە کەشێکی ئازادانەدا و ئارەزوومەندانـە کـاری لەسـەر بکـرێ و ئازادییـەك کـە بـاڵ بەسـەر حـەرەمی زانکـۆدا دەکێـشێ، ڕەنگدانـەوەی لەسـەر توێژینـەوەی زانـستی دەبـێ و گەشـەی پـێ دەدات. هەندێك لەتوێژەران پێیان وایە دەبێ زانکۆکان هەر بەسروشتی سەربەخۆبن و لەلایـەن دەسـەڵاتدارانەوە سـەربەخۆییان بەهەنـد وەربگـیرێ، دەنـا چـالاکی توێژینەوەی زانکۆ لاواز دەبێ و ئەرکی سروشتی خۆی بەجێ ناهێنی[٣٣] بۆیە لامەرکەزی لەبەڕێوەبردنی کاری فێرکردندا و پاشکۆ نەبوونی بـۆ حکومـەت چ جـای حـزب، گەشـەی پێـدەدات و ئـەزموونی وڵاتـانی پێـشکەوتوو ئەمـەی سەلماندووە[٣٤].

• بەهرەمەنـد بـوون لـە ڕاسـپاردە و چارەسـەری و بەرەنجامـەکانی ئـەو توێژینەوانەی ئەنجام دەدرێن و کارکردن بۆ جێبەجێکردنیان و خستنە ڕووی پراکتیکییانەی سوودەکانی لەو بوارەی کە توێژینەوەی لەسەر کـراوە. ئەمـە هەم هاندەر دەبێ بۆ توێژەران و وایـان لێ دەکـات بـەردەوام بـن، و هـەم بـۆ کۆمەڵگا و دامەزراوە حکومییەکان ڕوون دەبێتەوە کـە توێژینـەوەی زانـستی گرنگـە و بەچـالاکییەکی لاوەکـی نازانرێـت. توێـژەران کـە دەرەنجـامی توێژینەوەکانیان لـەبواری جێبەجێکردنـدا دەبیـنن، زیـاتر بڕوایـان بـەخۆیان دەبێ، هەر ئەو بڕوا و ویـستە پتـەوەش زانکۆکانمـان بـەرەو پـێش دەبـات و هەنگاو بەرەو داهێنان دەبەین، لەڕاسـتیدا زانکۆکـانی ئێمـە نـاتوانن لـەبواری

توێژینەوەی بۆشایی دەرەوەدا (الفضاء) لەزانکۆی هارڤارد سەرکەوتووترین، یان لەتوێژینەوەیەك لەتوێژینەوەکانی شێرپەنجە لە زانکۆی ستانفۆرد لێوەشاوەترین یان لەتوێژینەوەیەك لەتوێژینەوەکانی زانستی کیمیادا لە زانکۆی ئۆکسفۆرد باڵادەستتر بن[٣٥] بەڵام دەبێ و پێویستە ببێ توێژەرانی زانکۆکانمان لە توێژەرانی زانکۆی هارڤارد لە ڤەکۆڵین لە هۆکارو مەترسییەکانی بێکاری لەوڵاتی ئێمەدا یان کۆچی گەنجان بۆ دەرەوە سەرکەوتووترین وە لە لێکۆڵینەوە لە سروشتی نەخۆشی بریندارانی چەکی کیمیایی و گرفتە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکانی ماڵبات و خانەوادەی ئەنفالکراوەکان لە کوردستان لەتوێژەرانی زانکۆی (ستانفۆرد) کاراتر و باڵادەستتر بن. لەتوێژینەوە سەبارەت بە دانانی چارەسەر بۆ گرفتەکانی کشتوکاڵ و کەمی بەرهەم و نزمی ئاستی هەناردنی کاڵای ئابوورییانەی بەرهەمهاتوو لە وڵات بۆ دەرەوە، لەتوێژەرانی زانکۆی (ئۆکسفۆرد) وردتر و لێهاتووترین . بۆیە بە پوختی دەشێ بڵێین، کە توێژەران لەباریاندا هەیە، کاری گرنگ ئەنجام بدەن، بەڵام دەبێ دڵنیابن کە توێژینەوەکانیان نابنە دیلی ناو ڕەفەکانی کتێبخانە ئەکادیمییەکان و تۆز لێ نیشتوو و فەرامۆشکراو نابن.

- بوونی پلانی زانستی و داڕشتنی سیاسەتێکی نیشتمانییانە بۆ توێژینەوەی زانستی و پاڵپشتی لێکردنی و دیاریکردنی هێڵە گشتییەکانی ئەو ستراتیژییە کە پێویستە کاری لەسەر بکرێ ، زانکۆکان هەم دەبێ لە داڕشتنی سیاسەتەکە ڕۆڵی چالاکیان هەبێ و هەم لەجێبەجێکردنیشیدا کاری سەرەکی ئەنجام بدەن، چونکە لەو بوارەدا بە بەرنامە کاری توێژینەوە ئەنجام دەدرێت و ڕیزبەندی بوارە گرنگەکانی دەکرێ و هەوڵ و ماندووبوونی توێژەران دیار دەبێ و وەك ئاردی نێو دڕکانی لێ نایە ، لەلایەکی دیکەوە

بواری کاری هاوبەش فراوانتر دەبێ. لە پەیوەندی بەو لایەنەوە ، گرنگە توێژینەوەی زانکۆکان، وابەستەی بەرنامەیەکی چڕوپڕ بکرێ و کار لەسەر مەسەلەی گەشەپێدان و گرفتە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان بکرێ[٣٦] هەروەها بەهۆی سیاسەتێکی ڕۆشنی ئاواوە دەکرێ زانایان لەدەوری یەکدی خڕ بکرێنەوەو لەناو زانکۆکاندا بوار و هەلی کاری هاوبەش دەڕەخسێ و مامۆستایان و قوتابیانی خوێندنی باڵا وەکو تیمێکی توێژینەوە کار دەکەن[٣٧] و بەم جۆرە ڕێسا و بەرنامەی توێژینەوە دەچەسپێ، و دەبێتە پێداویستی ژیانی لە کۆمەڵگادا.

• دابینکردنی سەرچاوە و تاقیگە و کەرەستەی توێژینەوە بۆ توێژەران و گرنگیدان بە پەیداکردنی نوێترین سەرچاوەی زانستی و خستنە بەردەستی توێژەران و ئاسانکاری کردن بۆیان، بۆ ئەنجامدانی گەڕان و کنەکردنی زانستی و بەشداریکردن لە کۆبوونەوە و کۆنگرە نێودەڵەتییە زانستییەکان لەدەرەوە. هەر لەم بوارەدا فەراهەمکردنی تەکنەلۆژیای زانستی و ئامێر و کەلوپەلی بەکارهێنانی لەتوێژینەوەی زانستیدا توانستی توێژەران زیاد دەکات[٣٨] و کاتیان دەگێڕێتەوە و وردتر توێژینەوەکانیان ئەنجام دەدەن و ئەنجامەکانیان زانستییانەتر دەبێت.

• وێڕای ئەوانەی ئاماژەیان پێدرا میکانیزمی دیکە بۆ پەرەدان بە توێژینەوەی زانستی دەکرێ لەبەرچاو بگیرێ وەکو باشترکردنی پەیوەندی نێوان زانکۆکانمان و بنکە و ناوەندە توێژینەوەکانی پێشکەوتووی جیهانی و ڕاهێنانی توێژەران لەسەر چالاکترکردنی بزاوتی توێژینەوە و هەوڵدان بۆ دابینکردنی پشتیوانی مادی لە دام و دەزگاکانی کەرتی تایبەت لەسەر بنەمای بەرژەوەندی هاوبەش.

## بەشی چوارەم
## ئایندەی زانكۆكان و توێژینەوەی زانستی

زانكـۆی هاوچـەرخ، لـەدنیای ئـەمڕۆدا، لەبـەردەم پـرس و ئاریـشەی جۆراوجـۆردا خـۆی دەبینێتـەوە، كـە گرنگترینیـان سروشـتی ئـەو ئـەرك و كارانەیە كە دەبێ بەرەچاوكردنی ئەو گۆڕانكارییە تەكنەلۆژی و ئابوورییانەی جیهانی گرتۆتەوە ئەنجامیان بدات و جۆرو چۆنیەتی ئەو مەعریفە زانستییەی كـە دەبـێ بەرهـەمی بێنـێ و گەشـەی پێبـدا و پێگەیـەنێ، سـەرەڕای پەیوەندییەكانی لەگەڵ كۆمـەڵگا، پێگەیاندنی ئـەو نەوەیـەی كـە سبەینێ پێشڕەوایەتی كۆمەڵگا دەكات، هەتا جۆرو شـێوازی پـسپۆڕی و توێژینـەوەی زانستی كە دەبێ لێی ئەنجام بدرێن هـەموویان، لـە زانكـۆی ئاینـدەدا، جێـی قسە و باس و گەنگەشەكردنن.

گرفتە بنچینەییەكانی زانكۆكان لە داهاتوودا بریتی دەبێ لەپێناسەكردن و زانینی ئەو ڕۆڵـەی كـە دەبـێ لـە كۆمـەڵگا هـەیانبێ و هـەروەها سـەر لـەنوێ دۆزینـەوەی پێكهاتـەی ئـەو دەسـەڵاتەی كـە ڕێیـان پێـدەدات بـە چـالاكی كاربكـەن، بـێ دۆزینـەوەی چارەسـەر بـۆ ئـەم مەسـەلانە زانكـۆ بـێ ئامـانج دەبێ[٣٩] زانكـۆ لـە وڵاتـە پێـشكەوتووەكاندا لـە ئێـستاوە لەگـەڵ دامـەزراوە پیشەسازییەكان لەبواری توێژینـەوەی زانـستیدا لەململانێیـەكی گـەورەدان و لەداهاتوودا ئەو ململانێیە قووڵتر دەبێتەوە ، هەر بۆیەش زانكۆكان لەهەڵپەی ئەوەدان خۆیان بۆ ئاینـدە بگـونجێنن و لـە زانكـۆی دەسـتەبژێرەوە ببن بـە زانكۆی میللی و جەماوەری بەرفراوان و هـەروەها وەكـو زانكـۆی بەرهـەمهێن خۆیان بناسێنن و درێژە بەمانەوەی خۆیان بدەن[٤٠].

چاوەڕوان دەكرێ ئەركی كۆمەڵایەتی زانكۆكان لە هەڵكشاندا بـێ، وەكـو دامەزراوەیـەكی كۆمەڵایـەتی كاریگـەری كۆمـەڵگایان بەسـەرەوە زیـاتر

بێت،[٤١] بەهەمان شێوە ژیانی کۆمەڵایەتی نێو زانکۆکان کاریگەری بەسەر جڤاکەوە دەبێ و توێژینەوەی زانستی و گەڕان بەدوای ڕاستیدا ،[٤٢] کاری هاوبەشی لەهەردوولا دەوێ، توێژینەوەی زانستی لەئایندەدا کۆمەڵگا زیاتر دەکاتە ئامانجی خۆی و ئاراستەی دەکات. بۆیە ئەرکی زانکۆکانە بایەخ بەگرفتەکانی مرۆڤ بدەن، وەلەداهاتوودا، کۆسپە چاوەڕوانکراوەکانی بەردەم ژیانی خەڵك دەستنیشان بکەن و چارەسەریان بۆ پێشنیار بکەن، هەروەتر پەرە بەکاری هزری و داهێنان بدەن و بونیادی مەعریفی مرۆڤی ئایندەو زۆربوونی ژمارەی دانیشتوان و پیسبوونی ژینگەو،[٤٣] مەترسییە سروشتی و مرۆکردەکانی سەر چارەنووسی مرۆڤایەتی بخەنە بەر تیشکی لێکۆڵینەوە و لەو پێناوەدا بەرنامە و پەیڕەویان هەبێت.

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو گەشبینی و ئەرکە چاوەڕوانکراوانەدا، هەیە بەگومان و دڕدۆنگییەوە دەڕوانێتە داهاتووی زانکۆکان و توێژینەوەی زانستی، ئەویش بە هۆی ئەو بایەخەی کە ناوەندە مەدەنی و سەربازییەکانی توێژینەوەی زانستی لەدەرەوەی زانکۆکان هەیانە و ڕکابەری نێوانیان، ئەگەری بەستنەوەی خوێندنی زانکۆیی بەخواستە پیشەییەکانەوە، بەتایبەتیش لەبواری پیشەسازی و کارگەکاندا، کە مەترسی ئەوەی لێدەکرێ زانکۆی ئاییندە بکەوێتە ژێر فشاری دامەزراوە ئابوورییە گەورەکان و سروشتی باوی زانکۆیی خۆی لەدەست بدا [٤٤] ئەو گۆڕانکارییانە و وابەستە بوون و خۆگونجاندنە ئابووری و کۆمەڵایەتییانە کە لە زانکۆکان چاوەڕوان دەکرێ لەوانەیە جۆرێك لە فەرامۆشکردنی قوتابیان و وانەگوتنەوەی لێ بکەوێتەوە.[٤٥]

خوێندنی زانکۆیی لەدنیای ئەمڕۆماندا، بەشێوەیەك پەرەی سەندووە وادەبێتە پرۆژەیەکی بێ سنوورو لەژێر سایەی بەجیهانیبووندا بەپشت بەستن بەتەکنەلۆجیای ئەلکترۆنی و ئەنتەرنێت، دەستاودەست کردن و ئالۆ گۆڕکردنی مەعریفە لەبازاڕی زانستدا هەم هاوکاری و هەم ڕکابەری لەنێو زانکۆکاندا دروست کردووە، بەڕای هەندێك لەپسپۆڕان، ئەو پێشهاتانە، دەرکەوتنی پسپۆڕی نوێی لێ دەکەوێتەوە و کاریگەری دەبێ لەسەر دابەشکردنی کاری نێو زانکۆکان و وا چاوەڕوان دەکرێت هەر زانکۆیەك _نەك بەش یان کۆلێژێك _ پسپۆڕی لەبوارێکی زانستیدا پەرە پێبداو پانتایی کارەکانی فراوانتربێ و قوتابیان و توێژەرانی زانستی لە ولاتانی جیاجیای دنیادا لێی خڕ ببنەوە و لەچوارچێوەی پیتۆلییەکی دیاریکراودا کاربکەن .[٤٦] وەگرفتەکانی توێژینەوەی زانستی لەلایەنی مادی و کارگێڕی و کۆمەلایەتی[٤٧] کەم دەبنەوە بەلام، ڕێی تێدەچێ کۆسپی چاوەڕواننەکراویش قووت ببنەوە.

بەشێوەیەکی گشتی، جیهانگیری لە کارو چالاکییەکانی زانکۆدا ڕەنگ دەداتەوە، بۆیە سنوورەکان نامێنن وەك تێبینی دەکەین لەنێو هەندێك لەزانکۆکاندا هاوکاری و هەماهەنگی لەبواری خوێندن و توێژینەوەدا دەستی پێکردووە ئەویش لەڕێگای ئەو پرۆگرامەی بە(ئینتەرنێت ٢) ناسراوە، هەروەکو لەنێوان زانکۆی کالیفورنیا و چەند زانکۆیەکی مەکسیکی هەیە، هەروەها ئەو ڕێکەوتنەی لەسالی ١٩٩٩ وە لەنێوان ژمارەیەك لەزانکۆکانی ئەمریکا و یاباندا لەگۆڕێیە بەناوی transpacific interactive (distance education) کە بەو پێیە ئالوگۆڕی زانیاری وانە زانکۆییەکان دەکەن، ئەمە وای کردووە بیر لەدامەزراندنی زانکۆی تەواو

ئەلکترۆنی بکرێتەوە ، و ئەو بۆچوونەی لەلای هەندێك لەپسپۆڕان دروست کردووە، کە زانکۆ بەو شێوەیەی کە ئێستا باوە دەچێتە مێژووەوە[٤٨] بەلاَم بەهەق دەکرێ بلێین: چۆن تەلەفزیۆن نەیتوانی شانۆ بکات بە بەشێك لە مێژوو، وەئەنتەرنێت کتێبخانە بکا بە ڕابردوو، هەرواش پێشکەوتنی سەردەم گۆڕانکاری لەزانکۆدا دروست دەکات بەلاَم ڕێژەیی دەبێ و ئەرکی سەرەکی زانکۆ لەپێشڕەوایەتی کۆمەڵگادا درێژەی دەبێ، بەلاَم هەقە بپرسین ئێمە لەکوێی ئەو گۆڕانکارییانەین ؟وە ئایا خۆمان بۆ ئامادە کردووە ؟.

## ڕاسپاردەکان

دوای خستنەڕووی ئەو زانیارییانەی پەیوەندیدارن بەسروشتی توێژینەوەی زانستیو گرفت و شێوازەکانی پەرەپێدانی چالاکی توێژینەوە بەگشتی، بەگرنگی دەزانین لەپێناوی پەرەپێدانی توێژینەوەی زانستیو خوێندنی بالاَ لە ولاَتەکەمان ئەم ڕاسپاردانەی خوارەوە لەبەرچاو بگیرێن :

١- دابینکردنی سەربەخۆیی دارایی و کارگێڕی بۆ زانکۆو دامەزراوەکانی خوێندنی بالاَ کە بتوانن بودجەی شیاو تەرخان بکەن بۆ پەرەپێدان بەتوێژینەوەی زانستی ٠

٢- کردنەوەی سەنتەری جۆراو جۆری توێژینەوەی زانستی لەزانکۆکان کە ڕەچاوی هاوسەنگی بکرێ لەنێوان تایبەتمەندی ئەو شوێنەی زانکۆکەی لێیە لەگەڵ هێڵە گشتییەکانی ستراتیجی توێژینەوەی کوردستانی ٠

٣- پێکهێنانی لیژنەیەك لەئەکادیمییانی خودان ئەزموون لە پسپۆڕی جیاجیا بۆ دارشتنی سیاسەتێکی نیشتمانییانەی توێژینەوەی زانستی، بەهەماهەنگی لەگەڵ حکومەت و دام و دەزگا پەیوەندیدارەکان، وەدامەزراندنی ئەنجومەنی توێژینەوەکان، کارێکی بەبایەخ دەبێ٠

٤- پێویسته وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی پلان و پڕۆژەی هەبێ بۆ کاراترکردنی پەیوەندی نێوان زانکۆکان و وەزارەت و دام و دەزگا حکومییەکانی دیکە، و ئەو ڕاستییە لەلای سەرجەم دەزگاکانی حکومەت بچەسپێ: کە زانکۆ هاوکاریانە و ناکرێ هەروەك دەزگایەکی سادە سەیری بکرێت، بەڵکو، دەبێ ئەوە ڕوون بکرێتەوە، کە هەر وەزارەت یان دەزگا یان بەڕێوەبەرایەتییەکی حکومی، دەشێ وەدەتوانێ لەناو زانکۆدا لق یان بەش یان کۆلێژێك یارمەتیدەرو هاوکاری بێت ،چونکە لەکۆتاییدا زۆربەی دامەزراوە حکومییەکان درێژبۆوەی ئەو پسپۆڕییانەن کە لە زانکۆکاندا هەن ٠

٥- باشتر کردن و چالاککردنی ڕایەڵەی خزمەتی ئەلکترۆنی لەنێوان زانکۆکان لەلایەك و زانکۆکانی ئێمەو زانکۆ جیهانییەکان لەلایەکی دیکە بەمەبەستی هاریکاری کردن و ئاگا لەیەکتر بوون و زانینی دوا گۆڕانکاری و پەرەسەندنە زانستییەکانی جیهان و گرنگە توێژەران زۆر بەئاسانی لەم خزمەتە بەهرەمەندبن٠

٦- دابینکردنی هەلی یەکسان بۆ ئەکادیمییان بۆئەوەی بەشداری کۆنگرە زانستییە نێودەوڵەتییەکان بکەن، وە هەروەها لە خولەکانی ڕاهێنان و ئاست بەرزکردنەوەدا ئامادەییان هەبێ، پێویستە ئەم بوارە هەم فراوانتر و هەم چاکتر بکرێ و دەرفەتی یەکسان بۆ هەمووان وەك یەك مەیسەر بکرێت ٠

٧- پێدانی دەرفەتی زیاتر بەو مامۆستایانەی زانکۆ کە توانایەکی دیاری توێژینەوەیان هەیە بەوەی لەکاتی وانەگوتنەوەو هەندێك سەرقاڵی دیکەیان بگێرێتەوە و سوود لەتوانای زانستییان وەربگیرێ، وە پێویستە لەکن هەموو مامۆستایانی زانکۆ کاری توێژینەوەی رانستی وەکو ئەرکێکی سەرەکی هاوشانی وانە گوتنەوە بناسرێت٠

٨- کارکردن بۆ دەستنیشانکردنی ئەو قوتابیانەی لەقۆناغی خوێندنی بەکالۆریۆسدا توانای توێژەرییان تێدا بەدی دەکرێت، بەوەی دەستیان بگیرێ و ڕابهێنرێن و بکرێن بەتوێژەری زانستی شایستەو لەبوارەکانی خۆیاندا سوود لە توانستەکانیان وەربگیرێ٠

٩- هاندانی توێژەرانی زانستی بۆئەنجامدانی توێژینەوە لەسەر دیاردەو گۆڕانکارییە گرنگە هاوچەرخەکانی دنیا لەلایەك و، لاکردنەوە لە کێشە و ئاریشە کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسییەکانی وڵاتەکەمان و گرنگیدان بەمەسەلەکانی ئاسایشی نەتەوەیی و ڕاستییە مێژووییەکانی مافەکانی کوردو ئەو ستەم و جینوسایدەی بەرامبەری کراوە، لەلایەکی دیکە٠

١٠- هاندانی گرنگیدان بە خوێندنی باڵای تایبەت و کردنەوەی زانکۆو کۆلێژی ئەهلی بەمەرجێك لەژێر پێودانگەکانی جۆرایەتی کوالیتی ئەکادیمیدابن و لەلایەن وەزارەتی خوێندنی باڵاوە چاودێری بکرێن و هاندانی توێژەران بۆوەی لەکەرتی تایبەتیش کاربکەن و بەمە هەم بۆخۆیان دەستکەوتیان دەبێ و هەم توێژینەوەکانیش بەرهەمیان لێ دەکەوێتەوە و توێژینەوەی زانستی دەبێتە کارێکی دانپێدانراو ٠

## پەراوێزەکان


١- بڕوانه: د. ناجح الراوي، مشكلات الاستاذ الجامعي في العراق، ضمن كتاب، المؤتمر الاول للتعليم الجامعي في العراق (بغداد:١٩٧١) ص١٨٣.

٢- د. عبدالرحمن عدس، الجامعة والبحث العلمي — دراسة في الواقع والتوجهات المستقبلية، مجلة اتحاد الجامعات العربية، تموز ١٩٨٨، عدد متخصص (٢) .ص٣٥٣

3- Donald bligh :higher education (London:1999) p.142

٤- بربارا ماتيرو، وآخرون: الاساليب الابداعية في التدريس الجامعي. ترجمة د. حسين عبدالطيف و د. ماجد محمد (عمان: ٢٠٠٢ ) ص٢٥-٢٦.

٥- د. محمد منير مرسى، دراسات في التربية المعاصرة ( القاهرة: ١٩٧٧ ) ص٢٨.

٦-د. احمد صيداوي، نموذج الجامعة المنتجة، مجلة اتحاد الجامعات العربية يوليو١٩٨٧، العدد ٢٢ ص ١٣.

7- 141 p-٧ Peter scott, the crisis of the University (london:1984)

8- Victor G. onushkin : planning the development of Universities: Unsco (Paris: 1973) vol: 11,P 96

٩- بڕوانه د. طاب ابو شرار، نحو بعد ثالث لعملية البحث العلمي، المجلة الثقافية، نيسان ١٩٩١، العدد ٢١، ص ٦٨-٦٩.

١٠- نووسیومانه ( خەرجكردن) نەك ( تەرخانكردن) چونكه لە ولأتى ئێمە هەتاوەكو ئێستاش بودجەی تەرخانكراو بۆ توێژینەوەی زانستی نییە.

١١- بڕوانه د. عبدالرحمن عدس، المرجع السابق، ص٣٦٦-٣٦٨.

12- Fred n. kerlige: foundation behavioral research - (new york:1971) p.11

-يعقوب حسين نشوان، البحث العلمي واهميته في التعليم الجامعي المفتوح، (عمان: ٢٠٠٤). ص١١

١٣- د. عبدالرحمن عميرة، أضواء على البحث والمصادر ( بيروت: ٢٠٠٥) ص٢٥.

١٤- د. محمد منير مرسى، المرجع السابق، ص٢٩.

١٥- د. دوهيب سمعان، التعليم في الدول الاشتراكية (القاهرة ١٩٧٢) ص١٤٧.

١٦- د. جوسلين، المدرسة والمجتمع العصري، ترجمة: د. محمد قدري لطفي وآخرون. (القاهرة: ١٩٧٧) ص١٥٧.

17- Robert c. Wilson and others: college professors and their impact on students.(u.s.a:1975)p10.

١٨- د. احمد الخطيب، البحث العلمي والتعليم العالي (عمان: ٢٠٠٣) ص١١١.

١٩- د. عبدالرحمن عدس، المرجع السابق، ص ٣٧٤.

٢٠- بۆ زياتر زانيارى برِوانه: د. سامى سلطى عريفج، الجامعة والبحث العلمي (عمان: ٢٠٠١) ص٧٢.

٢١- نفس المرجع، ص٦١.

22- Tyras – hillway: introduction to research (bostn:1964) p.5

٢٣- لافى ماجد الحربي، النشر العلمي فى الوطن العربي، مجلة الفكر العربي ( بيروت: ١٩٩٩) العدد الثامن والتسعون، ص ٤٩.

٢٤- أحمد بو ملحم، ازمات التعليم العالي، وجهة نظر تتجاوز حدود الاقطار، مجلة الفكر العربي (بيروت:١٩٩٩ ) العدد الثامن والتسعون ص٢٦-٢٧.

25- Ben-David j-: research role of universities and Graduate Education( the international Eucyclopedia of education) edited by, t.husen(perganon: 1985)pp5383-5386.

٢٦- د. فاروق عبده فلية، اقتصاديات التعليم مباديء راسخة واتجاهات حديثة ( عمان: ٢٠٠٣) ص٦٤.

٢٧- د. احمد ابو زيد، جامعات المستقبل وتداول المعرفة، مجلة العربي ( الكويت: ٢٠٠٥) العدد ٥٦٤، ص٢٤.

28- Robert M. oneil, free speech in the college comunity( u.s.a: 1997) p168.

29- p 208. Christopher driver, the exploding university ( London: 1971)

30- Basil Fletcher, Universities in the modern world (oxford :1968) p.57.

31- Christopher driver,op.cit.p 257

٣٢- د. جميل جريسات، تقييم الهيئات الاكاديمية في الجامعات الحديثة، المجلة الثقافية (عمان: ١٩٩٠) العدد١٩, ص١٢-١٣.

٣٣-بروانه د. احمد صيداوي، التعليم العالي العربي من الواقع الى التطوير النوعي، المجلة العربية لبحوث التعليم العالي سبتمبر ١٩٨٤ العدد الثاني، ص ١٠.

٣٤- ماكوتو اسو وايكو امانو، التعليم ودخول اليابان العصر الحديث، (القاهرة: ١٩٧٦) ص٧٨.

٣٥- بروانه د. احمد صيداوي، الدراسات العليا في الجامعات العربية من والواقع الى الحاجات، مجلة اتحاد الجامعات العربية (عمان : ١٩٨٨) العدد المتخصص (٢)، ص٢٤٧.

٣٦- داود ماهر محمد، التعليم المستمر ( الموصل: ١٩٨٨) ص٢٦١.

37- Dr.R.A. Demoor, Universities Expansion( Bulletin of international Association of Universities(Paris: 1976) vol:24 no.1 p19.

٣٨- د. ادمز، التعليم والتنمية القومية ترجمة: د. محمد مير مرسى ( القاهرة ١٩٧٤) ص ٨٣.

39- Murray G. Borss, the Universities the Anatomy of academe (new York :1976) p273

٤٠- داخل حسن جريو، التعليم الجامعي المعاصر وتوجهاته وبعض اتجاهاته الحديثة، مجلة بحوث مستقبلية. (الموصل: ٢٠٠٣) العدد السابع، ص١٣,١٧ .

41- Jerry Hochbaum, Structure and process in Higher education, from; (College and students )edited by ,Kenneth A.feldman (U.S. A: 1972) P. 5.

42 -Basil fletcher. Op . Cit. p. 89.

وه بڕوانه: د.مصلح الصالح، عوامل التحصيل الدراسي في المرحلة الجامعية، (عمان: ٢٠٠٤) ص٣٥.

٤٣ – د. محمود السمرة، الجامعة وتحديات القرن الحادي والعشرين، المجلة الثقافية، (عمان: ١٩٩٠) العدد (٢٠)، ص ١٢–١٤ .

٤٤– بڕوانه: الين تورين : الفناء او التغيير في الجامعات، مجلة مستقبل التربية، مطبوعات اليونسكو، (القاهرة: ١٩٧٤) العدد الثامن، ص ٥٩١–٥٩٥.

٤٥– وليم هابر، السلطة واستعمال القوة، ضمن كتاب ( دور الجامعات في عالم متغير)، باشراف د. كيرتز، ترجمة: عبدالعزيز سليمان، د. ابراهيم عصمت مطاوع (القاهرة: ١٩٧٥) ص٨٥ .

٤٦– د. احمد ابوزيد، مرجع سابق، ص ٢٣–٢٤ .

٤٧– د. ذوقان عبيدات وآخرون، البحث العلمي، (عمان: ٢٠٠٤) ص ٦٤–٦٥.

٤٨– د. احمد ابوزيد، مرجع سابق، ص ٢٤–٢٥.

## ڕیزبەندی سەرچاوەکان

### - سەرچاوە عەرەبییەکان:

١– کتێب :

د. احمد الخطيب،

البحث العلمي والتعليم العالي، دار المسيرة ،(عمان: ٢٠٠٣)

د. ادمز :

التعليم والتنمية القومية، ترجمة د. محمد منير مرسى، عالم الكتب ،(القاهرة: ١٩٧٤)

بربارا ماتيرو وآخرون :

الاساليب الابداعية في التدريس الجامعي، ترجمة د. حسين عبداللطيف بعارة، د. ماجد محمد الخطاب دار الشروق، (عمان: ٢٠٠٢).

د. جوسلين :

المدرسة والمجتمع العصري، ترجمة د. محمد قدري لطفي وآخرون، علم الكتب، طبعة منقحة، (القاهرة: ١٩٧٧).

داود ماهر محمد :

التعليم المستمر، دار الكتب (الموصل: ١٩٨٨).

د. ذوقان عبيدات وآخرون:

البحث العلمي، مفهومه وادواته وأساليبه، دار الفكر، الطبعة الثامنة ،(عمان: ٢٠٠٤).

د. سامي سلطى عريفج:

الجامعة والبحث العلمي، دار الفكر ،(عمان: ٢٠٠١)

د. فاروق عبدة فلية:

اقتصاديات التعليم، مبادىء راسخة واتجاهات حديثة، دار المسيرة ،(عمان : ٢٠٠٣)

د. عبدالرحمن عميرة :

اضواء على البحث والمصادر، دار الجيل ، (بيروت: ٢٠٠٥).

د. محمد منير مرسى:

دراسات في التربية المعاصرة، دار النهضة العربية ،(القاهرة : ١٩٧٧).

د. مصلح الصالح:

عوامل التحصيل الدراسي في المرحلة الجامعية، موءسسة الوراق للنشر، (عمان: ٢٠٠٤).

د. وهيب سمعان :

التعليم فى الدول الاشتراكية، مكتبة الانجلو المصرية ، (القاهرة: ١٩٧٧).

د. يعقوب حسين نشوان :

البحث العلمي واهميته في التعليم عن بعد والتعليم الجامعي المفتوح، دار الفرقان، (عمان: ٢٠٠٤).

## ٢- توێژینەوەی زانستی و وتار – لە گۆڤارەکاندا-:


د. احمد ابوزيد :

جامعات المستقبل وتداول المعرفة، مجلة العربي، العدد: ٥٦٤ ( الكويت: ٢٠٠٤).

احمد بوملحم:

ازمات التعليم العالي: وجهة نظر تتجاوز حدود الاقطار، مجلة الفكر العربي، العدد: الثامن والتسعون، (بيروت: ١٩٩٩).

د. احمد صيداوي:

التعليم العالي العربي من الواقع الى التطوير النوعي، المجلة العربية لبحوث التعليم العالي، العدد الثاني، ١٩٨٤.

الدراسات العليا في الجامعات العربية من الواقع الى الحاجات، مجلة اتحاد الجامعات العربية، العدد المتخصص (٢) (عمان: ١٩٨٨).

نموذج الجامعة المنتجة ، مجلة اتحاد الجامعات العربية، يوليو (عمان: ١٩٨٨)، العدد ٢٢.

الين تورين ،

الفناء او التغيير في الجامعات، مجلة مستقبل التربية، مطبوعات اليونسكو (القاهرة: ١٩٧٥) العدد الثامن .

د. جميل جريسات،

تقييم الهيئات الاكاديمية في الجامعات الحديثة، المجلة الثقافية، (عمان: ١٩٩٠) العدد (١٩).

د. طالب ابوشرار ،

نحو بعد ثالث لعملية البحث العلمي، المجلة الثقافية، (عمان: ١٩٩١) العدد (٢١).

د. عبدالرحمن عدس ،

الجامعة والبحث العلمي، دراسة في الواقع والتوجهات المستقبلية، مجلة اتحاد الجامعات العربية، العدد المتخصص (٢) (عمان: ١٩٨٨).

د. لافي ماجد الحربي،

النشر العلمى في الوطن العربي، مجلة الفكر العربي، السنة العشرون (٤)، (بيروت: ١٩٩٩) العدد الثامن والتسعون .

د. محمود السمرة،

الجامعة وتحديات القرن الحادي والعشرين، المجلة الثقافية، (عمان: ١٩٩٠) العدد (٢٠).

د. ناجح الراوي ،

مشكلات الاستاذ الجامعي فى العراق، ضمن كتاب ( الموءتمر الاول للتعليم الجامعي في العراق )، (بغداد: ١٩٧١).

وليم هابر ،

السلطة واستعمال القوة، ضمن كتاب (دور الجامعات في عالم متغير، باشراف، ستيفن د. كيرتز ) ترجمة، د. عبدالعزيز سليمان، د. ابراهيم عصمت، (القاهرة: ١٩٧٥).

**سەرچاوە بەزمانی ئینگلیزی:**

- Basil Fletcher:
Universities in the modern world (oxford :1968)
- Ben-David j:
research role of universities and Graduate Education( the international Eucyclopedia of education) edited by, t.husen(perganon: 1985.
- Christopher driver:
the exploding university ( London: 1971)
- Donald blig:
higher education (London:1999).
- Fred n. kerlige:
foundation behavioral research - (new:york :1971)p : .

- Jerry Hochbaum:
Structure and process in Higher education, from; (College and students)edited by ,Kenneth A.feldman (A: 1972). .
- Murray G. Borss:
the Universities the Anatomy of U.S.academe (new York :1976).
PETER - - SCOTT:
the crisis of the University ( london:1984)
- Dr.R.A. Demoor:
Universities Expansion( Bulletin of international Association of Universities(Paris: 1976) vol:24 no.1.
- Robert c. Wilson and others:
college professors and their impact on students. (U.S.A:1975).
- Robert M. oneil:
free speech in the college comunity( U.S.A: 1997)
- Tyras hillway:
introduction –to research (Bostn:1964)
- Victor G. onushkin :
planning the development of Universities: Unsco (Paris: 1973) vol: 11.

*الخلاصة*

## الجامعة والبحث العلمي

**د. قادر محمد**

هذه الدراسة مخصصة لتتبع حالة البحث العلمي فى جامعاتنا وأهم المشاكل والعراقل التي تواجهها ، ومدى فاعلية تلك العوائق في تعثر مسيرتنا العلمية وتدني مستوى جامعاتنا ومعاهدنا العلمية في مجال أجراء البحوث والاستفادة منها وتداعيات ذلك على مجمل الحركة الاكاديمية وسمعة الجامعات فضلا عن المجتمع ومكوناته .

بالاضافة الى المقدمة والتوصيات، يتكون البحث من اربعة فصول : عالج الفصل الاول أهمية البحث العلمي داخل المؤسسات الاكاديمية ومدى تداخله مع المصالح الاجتماعية والسياسية والاقتصادية خارج نطاق الهيئات الاكاديمية. خصص الفصل الثاني لتحديد وتشخيص تلك العراقل التى تحول دون الاهتمام بالبحث العلمي واستثمار مجالاته فضلا عن تنميته وتوجيهه نحو التعامل معه كحالة قائمة وكضرورة علمية بجانب المهمات الاخرى التى تؤديها الجامعات .

ركز الفصل الثالث على الخطوات التي ينبغي ان نخطوها فى سبيل الاهتمام بمجالات البحث العلمي وكيفية النهوض بها، ويتضمن حلول على شكل اقتراحات تتضمن معالجات آنية ومستقبلية لمشكلة اقصاء وتهميش الدور البحثي لأساتذة الجامعات والمؤسسات الاكاديمية. عالج الفصل الرابع مستقبل الجامعات والبحث العلمي في ضوء التطورات والتغيرات التي حصلت على المستوى الكوني داخل منظومة العولمة ومايتعلق بها من التقدم التكنولوجي وانعكاسها على دور الجامعات والمؤسسات البحثية في المستقبل.

*Abstract*

# University and Scientific Research

**Dr. Qadir Muhammad Pishdari**

The present study is concerned with the status of scientific research in our Universities . It studies the disadvantages and the weak points that lead to the lack of scientific research in our academic life. The study also attempts to find proper solutions for this. Hopping to activate the role of the university and the academic institutions in the society.

Apart from the introduction and the conclusion, the study four sections. Sections one is devoted to the status and the importance of the scientific research in the society.

Section two traces the problems and the obstacles in the way of advancing scientific research, notable among such obstacles are lack of financial support, lack of special institutions and plans inside the university for scientific research, shortage of time for teachers to conducting scientific research lack of a scientific atmosphere for this purpose and the vague national policy for encouraging scientific research.

Section three discusses the way that scientific research can be developed and bettered through consolidating the universities, infrastructure, establishing scientific research centers, setting strategic and creative plans, having a national policy for research and providing the necessary requirements for scientific research.

Section four tackles the future of the scientific research, the role and the task of the universities regarding research in the modern world.

# هەلویستێ ئارنۆلد ویلسونی ژ کێشەیا کوردی
## نیسانا ١٩١٨ ـ چریا ئیکێ ١٩٢٠

**خەلیل مستەفا ئۆسمان**
مامۆستای هاریکار/ بەشی مێژوو/ کولیژا ئادابێ /زانکۆیا دهۆك

**ئارنۆلد ویلسون و کیشەیا کوردی**
**١٩١٨ ـ ١٩٢٠**

**پێشەکی:**

پەیدابونا شەرێ جیهانیێ ئیکێ (١٩١٤ــ١٩١٨) بارودۆخەکێ نوی ل دەڤەرا رۆژهەلاتا ناڤەراست پەیداکر، کوردستان بوو گۆرەپانا شەڕ و پێکدادانا د ناڤبەرا هێزێن شەرڤان دا[1]. وهێزێن لەشکرێ بریتانی دەست ب داگیرکرنا باشۆرێ عیراقێ کر و پاشان بەرەف دەڤەرێن کوردستانێ کەفتنە کاری ل دویماهیا سالێن شەڕی[2].

ل دەمێ گرێبەستا مۆدرس هاتیە مۆرکرن د ناڤبەرا هەڤپەیمانان و ئۆسمانیا ل (٣٠) ی چریا ئیکێ ١٩١٨ێ، هێزێن بریتانی گەهشتبوونە (حمام العليل) ب نێزیکیا (٩)

---

(1) جورج لنشوفسكي، الشرق الاوسط في الشؤون العالمية، ترجمة جعفر الخياط، (بغداد، ١٩٦٤)، ج١، ص ص٢ـ٦.

(2) بۆ پتر پێزانینان ل دۆر کارتێکرنا شەڕێ جیهانیێ ئێکێ ل سەر کوردان بنێرە: كمال مظهر أحمد (الدكتور)، كردستان في سنوات الحرب العالمية الأولى، ترجمة محمد عبدالكريم، (بغداد، ١٩٧٧).

کم ژ باشوریَ ڕۆژئاڤاییَ میسل[٣]، و ل دویڤ بریارێن وەزارەتا شەڕی (war office) ئەڤ هێزە دبەردەوام د پێشکەفتنا خۆ دا بەرەف باژێرێن ویلایەتا میسل ل دویڤ مادەیێن (٧) و (١٤) ژ بەندێن مۆدرس[٤].

هێزێن لەشکەریَ بریتانیَ ل (٧)ی چریا دوویَ ١٩١٨ چوونە د ناڤ باژێری میسل دا ، پاشان بەردەوام بوون د داگیرکرنا باژێرکێن ویَ دا، و ل دویماهیا مەها کانینا دوویَ ١٩١٩یَ هەمی باژێرێن دەڤەرا بادینان هاتنە داگیرکرن[٥].

ئەڤ بارودۆخیَ نویی پەیدابووی دلیڤەیەکا باش پەیداکر ژ بۆ تێکەلی و پەیوەندییێن ئێکسەر د ناڤبەرا بریتانیا و کوردا دا[٦]، ئەڤە ژی بوو هۆکارەکیَ سەرەکی کو دەسهەلاتداریا سیاسی یا برێتانی هزریَ د ڤان پەیوەندییا دا بکەت ب مەرەما پەیداکرنا ناوچەیەکا سنۆری یا هێمن بۆ میزۆبۆتامیا، وبەرسنکگرتنا هەر پێشهاتەکا ناوچەیی یان نیڤ دەولەتی ئەڤ چەندە دیار بیت ژ بەرسڤا ئارنۆلد ویلسونی سەبارەت ویَ یادداشتا شەریف پاشای[٧] پێشکێشی حکوومەتا بریتانیا کری ل ٣ی چریا ئێکیَ ١٩١٤ یَ کو تێدا

---

(3) w.r.hay, two years in Kurdistan, experiences of political of fiacre1918 -1920,(london,1921), p.110.

(4) بۆ پێزانینان ل دۆر ڤان بەندا بنێرە: جرجیس فتح الله، یقظة الکرد: تاریخ سیاسي ١٩٠٠ـ١٩٢٥، ومما یتناول النزاع علی جنوب کردستان أمام عصبة الأمم مع الوثائق والمذکرات المتعلقة به (اربیل، ٢٠٠٠)، ص١٣٣.

(5) عبدالمنعم الغلامي، ثورتنا في شمال العراق، (بغداد، ١٩٦٦)، ص ص ٣٤ـ٣٥ .

(6) L.t.col.s.r.Arnold wilson,mesopotamia 1917-1920, Aclsh of loyal, Apresended ltisterical record,(london,1931), p. 198.

(7) شەریف پاشا (١٨٦٥ـ١٩٥١): کوڕیَ مەزنیَ سەعید پاشای خەندانە، بوویە ئەفسەر د ناڤ لەشکەریَ ئۆسمانی دا و ل سالا ١٨٩٠یَ ئەمینا خانم نەڤیا محەمەد پاشای والیَ مصریَ مارەکریە، چەندین پلەیێن کارگێری ل ئستەنبوولیَ وەرگرتینە، و بوویە سەفیریَ دەولەتا ئۆسمانی ل سویدیَ، هاتیە تومەتبارکرن ب تیرورکرنا سەرۆك وەزیرێن ئۆسمانی مەحموود پاشا، ژ بەر ڤیَ چەندیَ حوکمیَ سێدارەدانیَ کەتیە سەر، لەوما بزاڤا خۆ یا سیاسی و نەتەوایەتی ژ دەڤەریَ دەولەتا ئۆسمانی ئەنجام داینە، چوویە بەر دلۆڤانیا خودیَ ل سالا ١٩٥١یَ. بۆ پتر پێزانینا بنێرە: صالح محمد حسن بادی، شریف باشا ودوره السیاسي (١٨٦٥ـ١٩٥١)، (دهوك، ٢٠٠٥).

هاتیە ((ئەو یێ ئامادەیە ژ بۆگەنگەشەکرنا هەر بۆچوونەکا شەریف پاشا پێشکێش دکەت ل دۆر کێشەیا کوردی))[8].

گەلەك ئەگەر هەبوون کو سەرکردێن کورد هاندای پەیوەندییێ ب بریتانیا بکەن، ژ وانە کارگێریا توندا دەسەلاتداریا ئۆسمانی ب سەدەهان سالە، وبوونا کوردستانێ وەك مەیدانەکا شەرِی د ناڤبەرا دەولەتێن شەرِکەر دا[9]، هەر وەسا کارتێکرنا بنەمایێن (١٤) یێ ویلسونی ئەڤێن ل کانوونا دوویێ ١٩١٨ هاتینە راگەهاندن[10]، نەخاسمە بەندێ (١٢)ێ ئەوێ گرێدای ب چارە نڤیسێ مللەتان ڤە.

مللەتێ کورد وەکو هەمی مللەتێن جیهانێ ب ئومێد بوویە کو هەڤپەیمان هاریکاریا وان بکەن ژ بۆ بدەستڤەئینانا سەربەخۆییا کوردستانێ[11]، نەخاسمە پشتی ئنگلیزا و فرەنسیا بەیاننامەیەکا هە ڤیشك ل تشرینادوویێ ١٩١٨ێ ل دوور هاریکاریا مللەتێن ئازادبووی ژبن دەستێ دەسەلاتداریا ئۆسمانی و دامەزراندنا حکومەتێن ئازاد بوڤان مللەتان بەلافکری[12].

ل دۆر ڤان پێشهاتیێن نوی پەیدابووین ژ ئەنجامێ شەرِێ جیهانییێ ئێکێ، ئاخفتنێن زۆر هەبوون دەربارەی رزگارکرنا کوردا ل ژێر دەسەلاتداریا ئۆسمانیا ودامەزراندنا کوردستانەکا ئازاد، سەرۆك وەزیرێن بریتانی (لویدجورج) [13] ل دۆر ڤێ چەندێ

---

([8]) أحمد عثمان أبو بكر (الدكتور)، كردستان في عهد السلام (بعد الحرب العالمية الأولى)، (اربيل، ٢٠٠٢)، ص ص٢٤٥ـ٢٤٦.

([9]) محمد امين زكي، خلاصة تاريخ كرد وكردستان، ترجمة محمد علي عوني، (بغداد، ١٩٦٠)، ص ص٢٦٢ـ٢٦٤.

([10]) كمال مظهر أحمد، المصدر السابق، ص ص٤٢ـ٤٥.

([11]) جەمال بابان، هەندێك لە دادوەری بەناوبانگ یاخود (محاكمات) مەزن لە مێژوودا، (بەغدا،١٩٨٠) ل١٢.

([12]) N.lowe,mastering modern world history (hong kong,1982) .p.p24-28.

([13]) لويد جورج (١٨٦٣ـ١٩٤٥): ژ مەزنە سیاسەتمدارێن ئنگلیزە، ئەندام بوو د پارتا (الأحرار) دا ، و ل سالا ١٨٩٠ بوویە ئەندامێ پەرلەمانێ ئنگلیزی، گەلەك بەرپرسیارییێن کارگێری وەرگرتینە مینا

ڕاگەهاندەك ل ئەنجوومەنێ گشتی بریتانی دایە ل ڕۆژا ١٨ێ چریا دووێ ١٩١٨ تێدا هاتیە: ((ئەو كوردێن ستەم وتەعداری دیتی ل ژێر دەسەلاتداریا توركا، دڤێت مافێن خۆ هەبن د سنۆرێن نەتەوەی دا)) (١٤).

ژ بەر ڤێ چەندێ سیاسەتمدارێن ئنگلیزا تووشی ئالۆزیەكێ بوون، كو دڤێت ب ئەركێ پاراستنا بەرژەوەندیێن بریتانیا ڕابن ل كوردستانێ، و ژ لایەكێ دی ڤە دڤێت ئەو بەلێنێن داینە كورد ومللەتێن دی ل دەڤەرێ ب دامەزراندنا قەوارەیێن سەربەخۆ جێ بەجێ بكەن، لەوما چەندین بیر ورا وبۆچوون دەربارەی چارەسەركرنا كێشەیا كوردی پەیدابوون.

**بەندی ئێكێ: ژیاننامە ویلسونی**

ژ دایك بوییێ بازێڕێ لنكولنشایرە ل تەموزا ١٨٨٤ێ(١٥)، خواندنا خۆ یا سەرەتایی ل قوتابخانەیا نیشتمانی یا كەڤن دەست پێكریە، پاشان بەرەف بازێرێ شیشایر چوویە و ل سالا١٨٩٧ ب دوماهی ئینایە ، خواندنا خۆ یا ئامادەیی ل بازێرێ كلفت تەمام كریە(١٦)، وپاشان بەرەف كولیژا لەشكەری یا شاهازە چوویە و ل سالا ١٩٠٣ دەرچوویە(١٧).

---

سەرۆكاتیا وەزیران د ناڤبەرا ١٩١٩ـ١٩٢٢، چوویە بەر دلۆڤانیا خودێ ل سالا ١٩٤٥، بۆ پتر پێزانینا بنێرە: منتهى عذاب دويب، برسي كوكس ودوره في السياسة العراقية، رسالة ماجستير غير منشورة مقدمة إلى مجلس كلية الآداب، جامعة بغداد، ١٩٩٥.

(14) هاتیە وەرگرتن ژ: بيار مصطفى سيف الدين، السياسة البريطانية تجاه تركيا وأثرها في كردستان الشمالية ١٩٢٣ـ١٩٢٦، (دهوك، ٢٠٠٥) ص ٤٤.

(15) سروه اسعد صابر، كردستان من بداية الحرب العالمية الأولى إلى نهاية مشكلة الموصل ١٩١٤ـ١٩٢٦، دراسة سياسية ثقافية، (اربيل، ٢٠٠١) ، ص ٨٤.

(16) ارنولد تالبوت ويلسون، بلاد ما بين النهرين بين ولائين، ترجمة فؤاد جميل، (بغداد، ١٩٦٩) ص ٨.

(17) سؤدد كاظم مهدي، ارنولد ولسن ودوره في السياسة العراقية، رسالة ماجستير غير منشورة مقدمة إلى مجلس كلية الآداب، جامعة بغداد، ١٩٩٥، ص ص ٨ ـ ١٠.

پشتی دەرچوونا وی ژ کولیژا لەشـکەریّ پەیوەنـدی ب لەشـکەریّ بریتـانی کریـە ل هندستانیّ، و ژ بۆ ئەنجامدانا چەند کردارێن لەشکەریّ بـەرەف ئیرانـیّ هاتیـە و ل وێـریّ چەندین نەخشەیێن توبوگرافی ئامادەکرینە[١٨].

پشتی دیتنا گازیّ ل دەڤـەریّ ویلـسون هاتـە دەستنیـشان کـرن ژ لایـیّ حکوومـەتا بریتانیا کو ب ئەرەکیّ پاراستنیّ وزێرەڤانیـا کانییێـت گـازیّ ل دەڤـەرا مزگـەفتا سـلیمان رابیت ل سالا١٩٠٨یّ[١٩].

بزاڤێن سیاسی یێن ویلسونی ل دەڤەریّ دەستپێکرن ل وی دەمیّ پەیوەندی د گەل پرسـی کـوکس[٢٠] کـری وهاتیـە دەسـت نیـشانکرن کـو ب ئـەرکیّ دانانـا نەخـشەیەکا توبـوگرافی بـۆ دەڤـەرا عـەبادان ل سـالا١٩٠٩یّ، وگرێـدانا رێککەفتنـەکیّ د گـەل شـیخ خەزعەلی[٢١] ب مەرەما لێگەڕیانا گازیّ.

ل حزیرانـا ١٩١٠ هاتـە هەلبـژارتن بـۆ سـەرۆکاتیا قونـسلیا بریتـانی ل موحەمـەرە، پاشی هاتە دەستنیشانکرن بۆ هاریکاریّ برسی کوکس ل بوشەهر[٢٢]، ژ بەر شەهرەزاییا وی ل دەڤەریّ هاتیە دەستنیشانکرن بـۆ جێگریـا نوینـەریّ بریتـانی د لیژنـەیا سـنۆرەیا دەولەتی ئەوا هاتیـە دامەزرانـدن ژ بـۆ چارەسـەرکرنا کێشەیا سـنۆری د ناڤبـەرا ئـیران ودەولەتا ئۆسمانی دا ل سالا ١٩١٤یّ[٢٣].

---

([18]) ارنولد تالبوت ویلسون، المصدر السابق، ص ص ٨ ـ ٩.

([19]) مـصطفی عبـدالقادر النجـار، التـاریخ الـسیاسي لأمـارة عربـستان العربیـة، ١٨٩٧ـ١٩٢٥، (مـصر، ١٩٧١) ص ٢١٠.

([20]) سیر برسی کوکس (١٩٦٤ـ١٩٣٧): ئەفسەر ودبلوماسـیەکیّ بریتـانی بـوو، چـەندین بەرپرسـیارێن سیاسی ل عێراقیّ د ناڤبەرا سالان ١٩٢٠ـ١٩٢٣ ییّ، بۆ پـتر پێزانینـان بنێـرە: سـی.جـی. ادمونـدز، کورد وترك وعرب، سیاسـة ورحـلات وبحـوث عـن الـشمال الـشرقي مـن العـراق ١٩١٩ـ١٩٢٥، ترجمـة جرجیس فتح الله، (اربیل، ١٩٩٩)، ص ١٦٥.

([21]) مصطفی عبدالقادر النجار (الدکتور)، المصدر السابق، ص ٢١٠.

.([22]) L.t.col.sir arnold wilson,op.cit.,I,p.98

.([23]) Ibid, I, p.220

پشتی پەیدابوونا شەڕێ جیهانییێ ئیکێ (١٩١٤ــ١٩١٨) ویلسون ب ئـەرکێ ڕێبـەریا هێزێن لەشکەرێ بریتانیا بۆ داگیرکرنا باشۆرێ عیراقێ، وپاشـان هاتیـە دامەزرانـدن وەك هاریکارێ حاکمێ سیاسی ل باژێرێ بەسرە ل تەمووزا ١٩١٥.

ویلسون د ماوەیەکێ کێم دا شیایە شەهرەزابیا خۆ یا سیاسی دیار بکەت ژ بەر ڤـێ چەندێ هاتـە ڤەگوهاسـتن بـۆ بەغـدا وپۆسـتەیێ هاریکـارێ حـاکمێ سیاسـێ ل عیراقـێ وەرگرتیە ل چریا ئیکێ ١٩١٧ێ، و ل وی دەمی برسی کوکس میزۆبۆتامیا ب جهـ هـێلای و ل دویڤ بریارێن وەزارەتا موستەعمەراتێن بریتانی ویلـسون هاتـە دەستنیـشانکرن بـۆ ئەرکێ مەندووبێ سامی یێ بریتانی ل نیسانا ١٩١٨ێ.

دەمـێ شۆڕشـا بیـستێ ل عیراقـێ وکوردسـتانێ پەیـدابووی، گهۆڕینـەکا مـەزن د سیاسەتا بریتانیا پەیدابوو، بریار هاتـە دان ژ لایـێ حکوومـەتا بریتانیـا بـۆ ڤەگوهاسـتنا ویلسونی ژ عێراقێ وهاتیە دانان وەك ڕێڤەبەرێ کۆمپانیا گازا ئنگلیزی ـ فارسـی ل پـایزا ١٩٢١ێ، پاشان کارگێڕیا کۆمپانیا دارسی ل لەندەن وەرگرتیە ل سالا ١٩٢٦[(٢٤)].

ل دەستپێکا سالێن سیهێ ویلسون بەرەف کارێ سیاسـی چـوویە وبوویـە ئەنـدام د پارتا پارێزەرێن بریتانی دا، وپاشان بوویە نوێنەرێ پەرلەمانێ بریتانی د ناڤبـەرا سـالێن ١٩٣٣ـ١٩٣٩ێ، و ل دەمێ شەڕێ جیهـانیێ دووێ پەیـدابووی، ویلـسونی خۆبـەش کـر د ناڤـا رێـزێن هیـزا ئـەسمانیا شـاهانە، و ل ٣١ی گولانـا ١٩٤٠ێ د مـاوەیێ ئەنجامـدانا کردارەکا لەشکەری یـا ئـەسمانی فرۆکـا وی ل بـاژێری ئرنگهـام دکـەڤیت وگیـانێ خـۆ ژ دەست ددەت[(٢٥)].

---

([24]) Ibid, I, p.44.

([25]) ستیڤن همسلی لونگریك، اربعة قـرون مـن التـاريخ العراقـي الحـديث، ترجمـة سـليم طـه التكـريتي، (بغداد، ١٩٨٥)، ص ١٧٨.

**بەندێ دووێ: هەلویستێ ویلسونی ژ ئێکەم حکوومەتا کوردی**

ویلسون ژ سیاسەتمەدارێن بریتانییێن گرێدای قوتابخانەیا هندی یا ئیستعماری یە، کو ل دویڤ هزرا ڤێ قوتابخانێ خەلکێ موستەعمەراتان شیانێن ڕێڤەبرنێ نینن یان ژی ل ئاستێ ڕێڤەبەریا خۆیەتی نینن، ژ بەر ڤی چەندێ دڤێت بهێنە ب ڕێڤەبرن وفێرکرن ژ لایێ کارگێڕیا بریتانی یا ئێکسەر[٢٦]، ورۆلێ خەلکێ دەڤەرێ ب تنێ دانا شیرەت وپێزانینا یە بۆ حاکمێن بریتانی ب ڕێکا دامەزراندنا چڤاتێن باژێرڤانی[٢٧].

هەولێن ویلسونی بەرەف چاڤلێکرنا تاقیکرنا بریتانیا ل هندستانێ دچوو، ژ بۆ ملکەچکرنا هۆزێن کوردی ل کوردستانا باشوور، کو ل دویڤ هزرا وی جۆرە وەک هەڤیەک هەیە د ناڤبەرا سروشتێ کوردستانێ وباکورێ ڕۆژهەلاتا هندێ[٢٨]، وئەف سیاسەتە ژی یا پێکهاتی بوو ب پەیداکرنا قەوارەیەکێ هۆزەکی کو کەسایەتیەکا ب هێز سەرکردایەتیێ لێ بکەت، ب مەرجەکی دەسەلاتداریا بریتانی یا بەرز بیت وئەرکێ ئەڤێ کەسایەتی ب تنێ پەیداکرنا ئێمناهی وتەناهیێ ل دەڤەرێ و جێ بە جێ کرنا سیاسەتا حکوومەتا بریتانیا بیت[٢٩].

ویلسونی دەست ب جێ بەجێ کرنا ڤێ سیاسەتی کر هەر وەکی یا دیار ب وان ڕێنماییێن ئاراستەی میجەر نوئیل[٣٠] کرین دەمی هاتیە دامەزراندن وەک حاکمێ سیاسی

---

([26]) L.t col. Sir arnold wilson , op.cit., i. p.p. 3 – 4 .

([27]) ستیڤن همسلی لونگریك، المصدر السابق، ص ١٨٥.

.([28]) Lt. col . sir arnold wilson, op. cit., I, p.p. 88 – 89

([29]) ئەڤ جۆرە رژێمە دهێتە ناڤکرن ب (رژێما ساندیمان)، ئەڤا هاتیە جێ بە جێ کرن ژ لایێ روبرت ساندیمان د گەل هۆزێن باکوورێ ڕۆژهەلاتێ هندستانێ، بۆ پتر پێزانینا بنێرە: عثمان علي (الدكتور)، دراسات في الحركة الكوردية المعاصرة ١٨٣٣–١٩٤٦، دراسة تاريخية وثائقية، تقديم الدكتور عمر الهماوندي، (اربيل،٢٠٠٣)، ص ٢٦٧.

([30]) میجەر نوئیل : ئەفسەرەکێ بریتانی بوو، هاتیە هەلبژارتن وەك راوێژکارێ سیاسی ل حکوومەتا کوردی ل سلێمانیێ، کار ژ بۆ دامەزراندنا دەولەتەکا کوردی ل ژێر سەرپەرشتیا بریتانی دکر، هەڤالینی د گەل چەندین سەرۆك هۆزێن کوردی هە بوو، فێری زمانێ کوردی بوویە وهاتیە نیاسین

ل کەرکووکێ ل چریا دووێ ١٩١٨ کو تێدا هاتیە: ((دڤێت تو بزانێ کو دەسەلاتداریا لەشکەرییا بریتانی نە یا ئامادەیە کو ب شێوەیەکێ بەردەوام پشکەکێ ژ لەشکەری تەرخان بکەت ژ بۆ ئاکنجیکرنا وان ل سلێمانییێ یان ل هەر جهەکێ دیتر...دڤێت مەرەما تە دەست ڤەئینانا ئیمناهییێ بیت ل دەڤەرێ د گەل سەرۆك هۆزێن کوردی))[٣١].

هەر ژ بۆ جێ بە جێ کرنا ڤێ سیاسەتێ ویلسون رازی بوو ل دۆر وێ پێشنیازا شێخ مەحموودی ئاراستەکری ل چریا ئێکێ ١٩١٨، کو داخوازا هاتنا لەشکەرێ بریتانی بۆ بازێرێ سلێمانییێ ودەرێخستنا هێزێن ئۆسمانی، بەرامبەر دامەزراندنا قەوارەیەکێ سەربەخۆ ل ژێر چاڤدێریا بریتانی[٣٢].

ل دویڤ داخوازیا شێخ مەحموودی، میجەر نۆئیل وەك نوینەرێ حکوومەتا بریتانیا هاتە رەوانەکرن بۆ سلێمانییێ ل ١٦ی چریا دووێ ١٩١٨[٣٣]، ویلسونی چەند رێنما دانە میجەر نۆئیلی دەربارەی ڤێ چەندێ کوتیدا هاتیە ((تو یێ دەستویردایی ب دانانا شێخ مەحموودی وەك نوینەرێ بریتانیا ل سلێمانییێ ئەگەر ئەڤ چەندە یا پێتڤێ بیت، وهەر ب ڤان جۆرە کریارا رابی ل چەمچەمال وحەلەبچە. ودیار بکە بۆ سەرۆك هۆزێن کوردی کو ب هیچ شێوەیەکی کارگێرییەکا بیانی ل سەر وان ناهێتە سەپاندن)) [٣٤].

ژ بۆ پتر زێرەڤانیکرنا ب جهئینانا ڤێ سیاسەتێ ویلسونی سەرەدانا بازێرێ سلێمانییێ کر ل کانوونا ئێکێ ١٩١٨ێ، وکۆمبوونەك د گەل شێخ مەحموودی وسەرۆك هۆزێن دەڤەرێ کر، ودانپێدان ب ئامادەییا بریتانیا کر ژ بۆ هاریکاریا کوردا وزێدەکرنا

---

ب نوئیلێ کوردا ژ بەر خزمەتێن وی بۆ کێشەیا کوردی. بۆ پتر پێزانینا بنێرە: محمد رەسول هاوار، شێخ مەحموودی قارەمان ودەولەتەکەی خوارووی کردستان، (لەندەن،١٩٩٠).

.([31]) Lt. Col. Sir Arnold Wilson,op. cit.,I, p.127

([32]) F.o.,(371),(3407),(07739), from political Baghdad to foreign and .Tehran, dated ist, November,1918

([33]) المس بيل، فصول من تاريخ العراق القريب (١٩١٤ ـ ١٩٢٠)، ترجمة جعفر الخياط، (بيروت،١٩٧١)، ص ١٦٧.

([34]) عزيز الحاج، القضية الكردية في العشرينات،(بغداد،١٩٨٥)، ص ٦٧.

دەڤەرێن دەسەلاتداریا شێخ مەحمودی ب مەرجەکی ئەڤ دەسەلاتداریە ل ژێر چاڤدێریا حکوومەتا بریتانیا بیت[٣٥]، ویلسونی داخواز ژ هۆزێن کوردی کر هاریکار بن ژ بۆ دویرکرنا پروپاکندەیا تورکی ل دەڤەرێ[٣٦].

هەلبژارتنا شێخ مەحموودی بۆ نوێنەراتیا حکوومەتا بریتانی ل دەڤەرێ هاتەکرن د چارچوڤەیێ سیاسە تا ویلسونی دا بۆ ب هێزکرنا دەسەلاتداریا سەرۆك هۆزێن کوردی ودانانا وان وەك نوینەرێن فەرمی یێن حکوومەتا بریتانی ل دەڤەر وناوچێن ل ژێر دەسەلاتداریا وان[٣٧].

ژ لایەکێ دی ڤە دانانا شێخ مەحموودی بوو حوکمداریا سلێمانییێ ژ بەر رۆلێ ویێ بەرچاڤ وکەسایەتیا وی یا ب هێز ژ لایێ سیاسی ولەشکەری ڤە ل دەڤەرێ، ونەبوونا چارەنڤیسێ چەسپاندنا دەسەلاتداریا بریتانی یا ئێکسەر ل کوردستانێ، ژ بەر کو ئەڤ چەندە پێتڤی پارەکێ پتر وهێزەکا بەردوامە ل چیایێن کوردستانێ[٣٨].

ویلسونی رەفتار د گەل حکوومەتا کوردی دکر هەر وەك قەواریەکێ هۆزەکی یێ بەروەخت، مەرەم ژ بەردەوامبوونا وێ پاراستنا ئیمناهیێ ل کوردستانێ و ب جهئینانا پلانا حکوومەتا بریتانی کو ئەڤێ دەڤەرا ببیتە پشکەك ژ ئاخا ئیمپراتوریەتا بریتانی[٣٩].

ژ بۆ جێ بە جێ کرنا ئەڤێ سیاسەتێ ویلسونی فەرمانێن خۆ ئاراستەی ئەفسەر وحاکمێن بریتانی ل کوردستانێ کرن، کو دڤێت د پەیوەندی ورەفتارێن خۆ دا د گەل سەرۆك هۆزێن کوردی دا دهشیار بن و ب چ شێوەیا بەلێنا نەدەنێ سەبارەت پاشەرۆژا کوردستانێ[٤٠].

---

([35]) ,p.p. 116-117) Peter sluglett, britian in Iraq 1914–1932, (London, 1976.

([36]) Lt. col. Sir Arnold Wilson, op.cit.,I, p.129.

([37]) Ibid, I, p. 77.

([38]) عثمان علي، المصدر السابق، ص ٢٦٨.

([39]) سؤدد كاظم مهدي، المصدر السابق، ص ١٠٥.

([40]) Lt. col. Sir Arnold Wilson, op. cit., I, p.124.

ژ بەر ڤێ چەندێ ویلسونی دانپێدان ب شێخ مەحموودی نەکر وەك نوێنەرێ کوردا، بەلکو ئەڤ دەسەلاتداریا هەی یاهاتیە دان ژلایێ حکومەتا بریتانیا ڤە[41]، لەوما دامەزراندنا حکوومەتا شێخ مەحموودی چارەسەریەکا کاتی بوویە ومەرەم ژێ کێمکرنا بەرپرسیارەتیا لەشکەرێ بریتانی ل کوردستانێ وقورتالکرنا حکوومەتا بریتانیا ژ کردارەکا لەشکەری یا توند د بارودوخەکێ نە گونجایی دا، هەر وەکی خاتوو بیل[42] ڤێ راستیێ ئاماژە پێ دکەت ودبێژیت: ((بێ هاریکاریا لەشکەریا شێخ مەحموودی پێشکێش دکەت ل دەڤەرێ دڤیا مە هێزەکا لەشکەری یا مەزن تەرخان کربا ل دەڤەرێ.. شێخ مەحموود ژ لایێ سیاسی ڤە گرنگیەکا وەختی بوو ژ بۆ پاراستنا ئێمناهیێ ل دەڤەرێ)) [43].

ویلسونی ل دویڤ بنەمایێن لەشکەری یێن وەختی رەفتار د گەل حکوومەتا شێخ مەحموودی کریە، هەر وەکی د نامەیەکێ دا بۆ میجەر نۆئیل ئەڤ چەندە ئاشکرا دبیت کو تیدا هاتیە: ((حکوومەتا بریتانیا نە یا ئامادەیە هێزێن لەشکەری بەردەوام ب هنێرتە باژێرێ سلێمانیێ)) [44]، وئەدموندز[45] ڤێ چەندێ دووپات دکەت دەمێ دنڤێسیت: ((حکوومەتا شێخ مەحموودی هاتیە دانان ل بەر چەند بنەمایێن لەشکەری یە)) [46].

---

([41]) بو پتر پێزانینا بنێرە: ئاکو عەبدولکەریم شوانی، شاری سلێمانی ١٩١٨ـ١٩٣٢، لێکولینەوەیەکی سیاسی یە، (سلێمانی،٢٠٠٢).

([42]) کیر ترود بیل (١٨٦٨ـ١٩٢٦): خواندنا خۆ ل کولێژا شاهانە ل لەندەن وزانکۆیا ئیکسفورد، تایبەتمەندی ب زانستی مێژوویی وەرگرتین، چەندین گەریان برینە دەولەتێن ئوروپی ورۆژهەلاتا ناڤەراست، د گەل دەزگەهێن سنیوریا بریتانی ل قاهیرە کارکریە، پاش هاتیە دامەزراندن وەك سکرتێرا رۆژهەلاتی بۆ مەندووبێ پایەبەرزێ بریتانی، کاریگەریا بەرچاڤ هەبوو د دانا بریارێن سیاسی دا ل عێراقێ وکوردستانێ، چەندین پەرتووك نڤێسینە مینا (تاریخ العراق القریب) و(رسائل المس بیل)، بۆ پتر پێزانینا بنێرە: محمد یوسف القرشی، المس بیل وأپرها فی السیاسه العراقیه، (بغداد،٢٠٠٣).

([43]) Florance bell,the letters of Gertude bell,(London,1960), p.p.58 – 59.

([44]) Ibid,p.59.

ل وى دەمێ دەسەلاتداريا سياسى ولەشكەريا شێخ مەحموودى بوويە جهێ مەترسيێ ل سەر پلان وبەرژەوەندييێن بريتانى ل دەڤەرێ، بريتانيا بريارا نەهێلانا حكومەتا شێخ مەحموودى دا، و ب لاوازكرنا دەسەلاتداريا وى ڕابوو و بۆ ڤێ چەندێ ژى ب چەندين كريارا ڕابوويە مينا دامەزراندنا ميجەر سونى(٤٧) ل جهێ ميجەر (نۆئيلى) وريێدانا هندەك هۆزێن دەڤەرا هەلەبچە كو ل ژێر دەسەلاتداريا شێخ مەحموودى دەربچن ولادانا دەسەلاتدارێن لايەنگريا شێخ مەحموودى دكەن، وكێم كرنا دەرمالێن هاتين تەرخان كرن ژ بۆ حكوومەتێ(٤٨)، و ژ لايێ لەشكەرى ڤە دەست ب دامەزراندنا لەشكەرێ ليڤى(٤٩) هاتەكرن كو ب ئەركێ ئێمناهيا دەڤەرێ راببيت(٥٠).

---

(45) سى.جى. ئەدموندز: ژ دايك بويێ ١٨٨٩ێ، وخواندنا خۆ ل زانكۆيا ئيكسفورد ب دوماهى ئينانە، د گەل قونسليا بريتانيا گشتى كاركريە وەك وەرگێر، هاتيە دامەزراندن وەك جێگرى ئەفسەرێ سياسى ل عيراقێ ل سالا١٩١٥، ب چەندين كارێن سياسى ڕابوويە ل كەركووكێ وسلێمانييێ وكاركريە د ليژنەيا ميسل دا ل سالا ١٩٢٥، هاتيە دامەزراندن ب پلەيا وەزير د وەزارەتا دەرڤە يا يابريتانى دا وخانەنشين بوويە ل سالا١٩٥١ێ. بۆ پتر پێزانينا بنێرە: عبدالرحمن ادريس صالح البياتي، الشيخ محمود الحفيد (البرزنجي) والنفوذ البريطاني في كردستان العراق حتى عام ١٩٢٥، (لندن،٢٠٠٥)، ص ص ٣٤ـ٣٥.

(46) C.j.Edmonds,kurds,turks and arabs, (London,1960), p.p. 58–59.

(47) ايلى بانيستەر سون: ژ دايك بويێ سالا١٨٨١ێ، خواندنا خۆ يا دواناوەندى ل سالا ١٨٩٨ ب دوماهى ئينايە، ل بەنكا شاهانە يا ئيرانى كاركريە، گەشتەك كريە عيراقێ وخودانێ كتێبا ((رحلە متنكر إلى بلاد ما بين النهرين وكردستان))، هاتيە دامەزراندن وەك ئەفسەرێ سياسى ل سلێمانييێ ل سالا ١٩١٩ێ. چەندين كار وخزمەت بوو كوردستانێ كرينە مينا چاك كرنا كشتوكالى. سەرەراى هندێ كو دژايەتيا دەسەلاتداريا شێخ مەحموودى دكر. ل سالا ١٩٢٣ێ ب ئێشا سلەيێ مريە. بۆ پتر پێزانينا بنێرە: مير بصرى، أعلام الكرد، (لندن،١٩٩٥).

(48) ئي.جى.ئاو، العشائر الكردية، ترجمە وعلق عليە فؤاد حمة خورشيد، (بغداد،١٩٨٥)، ص ص ١٢ـ٢٥.

(49) رەفيق حلمى، يادداشت، كوردستانى عێراق و شۆڕشەكانى شێخ مەحموود، (بەغدا، ١٩٥٦) بەشى يەكەم، ل ١٠٢.

(50) F.o., (371), (5068), tel from admiral deroback, 16 , april, 1920.

ژ لایەکێ دی ڤە ویلسونی هەولدایە پێ گهورەکی بۆ دەسەلاتداریا شێخ مەحموودی ببینت، وپەیوەندی ب (حەمدی بەگ بابان) [٥١] کریە وهەڤپەیڤین د گەل هاتینەکرن کو ب ئەرکێ جێ بە جێ کرنا سیاسەتا حکوومەتا بریتانیا ل کوردستانێ ڕاببت [٥٢].

ویلسونی ژ بۆ ب جهئینانا ڤێ سیاسەتی ونەهێلانا حکوومەتا شێخ مەحموودی چەندین بیانوو (حجە) دەرخستینە مینا بارودوخێ کوردستانێ یێ پاشکەفتی ونەبوونا ڕێکێن هاتن وچوونێ وبەردەوامیا هەڤرکیێ د ناڤبەرا هۆزێن کوردی دا، بەردەوامبوونا دەسەلاتداریا شێخ مەحموودی مەترسیە ل سەر ئێمناهیا عیراق وئیرانێ وبەرژەوەندییا بریتانی دئێخیتە د مەترسیێ دا[٥٣]، ونەبوونا هەستێ نەتەوەی ونەبوونا پشتەڤانیا بەرفرە ھ ژلایێ بازێر وبازێرکێن کوردستانێ هۆییێن سەرەکی بووینە کو ویلسونی دەستنیشان کرین ژ بۆ ب دوماهی ئینانا دەسەلاتداریا شێخ مەحموودی[٥٤].

ژ لایێ خۆ ڤە کردارێن ویلسونی بوونە جهێ نە ئارامیێ ل دەف شێخ مەحموودی، ژ بۆ بەرەڤانی ژ دەسەلاتداریا کوردی بریارا ئەنجامدانا کردارەکا لەشکەری دایە دژی هێزێن بریتانی و ل ڕۆژا ٢٣ی گولانا ١٩١٩ دەست ب دەرخستنا دەسەلاتداریا بریتانی ل

---

([51]) حەمدی بەگ بابان: کورێ محەمەد پاشای کورێ سلێمان پاشای، ژ دایك بوویێ ستەمبوولێ یە ل سالا١٨٧٠، و ل وێرێ کولیژا لەشکەری ب دوماهی ئینایە، پشتی شەرێ جیهانیێ ئێکێ زڤریە بەغدا، پەیوەندێن ب هێز د گەل دەسەلاتداریا ئنگلیزا هەبوون، ژ بەر تێکچوونا پەیوەندییا د گەل حکوومەتا عێراقێ ل دۆر زەڤیێن کشتوکالی عێراق ب جهـ هێلایە، ل بەیرووتێ مریە ل سالا ١٩٦٠ێ.
بۆ پتر پێزانینا بنێرە: میر بصري، المصدر السابق، ص ١٥٩.

([52]) F.o., (371), (5068), (E 3398,11,4), India office,view of hamdi baban, November,1920.

([53]) I,p.143 Lt. col. Sir Arnold Wilson, op. cit.

([54]) عثمان علي، المصدر السابق، ص ص ٣٢٦-٣٢٧.

سلێمانیێ کر[٥٥]، وپاشی شێخ مەحمودی ژ ئێك لاڤە بریارا ڕاگەهاندنا حکوومەتەکا سەربەخۆ دا[٥٦].

ویلسونی ئەڤ کردارێن هاتینە ئەنجامدان ل سلێمانیێ ب دەرکەتن ل سەر سیاسەت ودەسەلاتداریا بریتانی ل قەلەم دان، و دەست ب هەوەکا لەشکەری یا بەرفرەهـ کر ژ بۆ نەهێلانا ڤێ دەسەلاتداریێ، وئەڤ هێزە ب هاریکاریا هێزا ئەسمانیا یا شاهانە ل دەربەندی بازیان روی ب روی هێزێن لەشکەرێ کوردی بوون، و د ئەنجام دا شێخ مەحموود هاتە بریندارکرن وپاشی هاتە بەدیل کرن وهاتە رەوانەکرن بۆ دادگەها لەشکەری ل بەغدا، وهێزێن بریتانی دوماهی ب دەسەلاتداریا کوردی ل سلێمانیێ ئێنا[٥٧].

**بەندێ سیێ: هەلویستێ ویلسونی ژ کێشەیا ویلایەتا میسل**

ویلسونی سێ هۆکار دەست نیشانکرینە کو وە ل بریتانیا کریە گرنگیێ ب دەتە کێشەیا کوردی:

١ـ پاشە ڕۆژا ویلایەتا میسل کو زۆربەی خۆجهێن وێ کوردن.

٢ـ مەسەلەیا ئەو جهێن دکەڤنە باکوورێ ویلایەتا میسل کو دەرڤەێن کوردانە.

٣ـ بزاڤا رزگاریخوازا کوردی ل کوردستانا ئیرانی کو گرنگییەکا تایبەت هەبوویە ژ لایێ سیاسەتمدارێن بریتانی.

ویلسون ئێك ژ سیاسەتمەدارێن بریتانی یە یێن جەخت ل سەر داگیرکرنا ویلایەتا میسل کری، بۆ ڤێ چەندێ ژی پێشنیازەك دایە حکوومەتا بریتانی کو ئەگەر هاتوو

---

(55) عومەر مەعروف بەرزنجی، مەحموود خانی دزلی شۆڕشگێڕی ڕۆژهەلاتی کوردستان، (هەولێر، ٢٠٠١) ل ٧٨.

(56) ئەحمەد خواجە، چیم دی، (بەغدا، ١٩٦٧)، بەرگی یەکەم، ل ل ٣٧ ـ ٣٩.

(57) جەمال بابان، ژێدەرێ بەرێ، ل ٨٤.

کردارێن لەشکەری ڕاوستیان ل دەڤەرێ وشەڕ ب دوماهی هات، دڤێت حکوومەتا بریتانی داکۆکییێ ل سەر داگیرکرنا ویلایەتا میسل بکەت[٥٨].

هەر بۆ جێ بە جێ کرنا ڤێ مەرەمێ ویلسون ب سەرپەرشتیا هەوا داگیرکرنا میسل ڕابوویە ودەستنڤیسا ئاگربەستا مۆدرس ل باژێری میسل بەلاڤەکریە[٥٩]، و ڕۆلەکێ گرنگ هەبوو ژ بۆ گرێدانا کۆنگرەیێ میسل ئەڤێ ل ٧ی چریا دووێ ١٩١٨ هاتیە ئەنجامدان، ب گەنگەشەکرنا ڤەکێشانا هێزێن ئۆسمانی ژ میسلێ[٦٠].

پشتی داگیرکرنا میسل ژ لایێ هێزێن لەشکەرێ بریتانی ڤە، ویلسونی هەولێن قایلکرنا دەسەلاتدارێن حکوومەتا بریتانیا کر، بۆ چەسپاندنا دەسەلاتداریا بریتانی یا ئێکسەر ل کوردستانێ، ول دۆر ڤێ چەندێ ژی بروسکە یەک بۆ وەزارەتا هندستانێ فرێکر وداخواز ژ دەسەلاتداریا بریتانی کریە کو بیر وبۆچوونێن خەلکێ دەڤەرێ دڤێت ل بەرچاڤ بهێنە وەرگرتن، کو داخوازیا وانا چەسپاندنا دەسەلاتداریا بریتانیا یا ئێکسەرە ل کوردستانێ[٦١].

ژ بۆ پتر ئاگەهداربوون سەبارەت بیر ورایێن خەلکێ کردستان ومیزۆبۆتامیا بەرامبەر چارەنڤیسێ وان، لیژنەیا کاروبارێن ڕۆژهەلاتی ل وەزارەتا هندستانێ، داخواز ژ ویلسونی کر ژ بۆ ئەنجامدانا ڕاوەرگرتنەکێ (استفتاو) ل دۆر هەلویستێ خەلکی ژ دامەزراندنا حکوومەتەکا عەرەبی ل دەڤەرێ وئەگەر ب ڤێ چەندێ ڕازی بوون، ئەوان کیش ناڤ دڤێت هەلبژێرن[٦٢].

ویلسون شیایە تا ڕادەیەکێ مەزن هزرا خۆ یا سیاسی ل سەر سیاسەتمدار و دەسەلاتداریا بریتانی بسەپینیت، ژ بۆ کو ئەنجامدانا ڤێ جۆرە ڕاوەرگرتنێ د

(58) Chassan R.attiya, iraq 1906 – 1921, apolitical study, (Beirut,1973), p.164.

(59) سؤدد كاظم مهدي، المصدر السابق، ص ٧٥.

(60) المس بيل، المصدر السابق، ص ١٥٣.

(61) سؤدد كاظم مهدي، المصدر السابق، ص ٨٤.

(62) ارنولد تالبوت ويلسون، المصدر السابق، ج٢، ص ص ٣٢٩ ـ ٣٣٠.

بەرژەوەندییا پێشنیازێن وی دا ل دۆر هەلویستێ خەلکێ دەڤەرێ ورازیبوونا وان ب چەسپاندنا دەسەلاتداریا بریتانیا ئێکسەر ل دەڤەرێ[٦٣].

ژ لایەکێ دی ڤە ویلسونی گەف ل خەلکێ کوردستانێ کرن ب رێکا ئەفسەر وحاکمێن بریتانی ل دەڤەرێ، ئەگەر هات وئەو دژی گرێدانا ویلایەتا میسل ب میزۆبۆتامیا ڤە بوون، ل وی دەمی چارەسەری دێ ددامەزراندنا دەولەتەکا کوردی دا بیت، ورەنگە ئەڤ دەولەتە د بن چاڤدێریا حکوومەتا بریتانیا دا نەبیت و ل وی دەمی دێ ئەڤ دەولەتە یا بێ بەهر بیت ژ وان هاریکارییێن ئابووری ئەڤێن دهێنە پێشکێش کرن ژ بۆ میللەتێن رۆژهەلاتنا ناڤەراست ژ لایێ حکوومەتا بریتانیا ڤە[٦٤].

ژ بۆ ب دەست ڤەئینانا ئەنجامێن ئەرێنی ل دۆر ڤێ راوەرگرتنێ، ویلسونی ب خۆ سەرپەرشتیا هەوا راگەهاندنێ کر ل دەڤەرێن گومان تێدا هەی سەبارەت هەلویستێ خەلکی بەرامبەر دەسەلاتداریا بریتانی مینا میسل وشنگارێ[٦٥]، وچەندین هەڤدیتن د گەل سەرۆك هۆزێن کوردی ل دەڤەرێ هاتنەکرن، ژ بۆ مسوگەرکرنا دەنگێن وان د ڤێ راوەرگرتنێ دا[٦٦].

ل دەستپێکا سالا ١٩١٩ێ چەندین گهورینکاری د سیاسەتا ویلسونی دا پەیدابوون بەرامبەر کێشەیا کوردی[٦٧] ئەڤ چەندە ژی دیار دبیت د وان دان وستاندنان دا ئەڤێن هاتینە ئەنجامدان د ناڤبەرا وەزارەتا هندستانێ وویلسونی دا، کو ویلسونی داخوازا دامەزراندنا چەند (دەولەتکێن) سەربەخۆ ل کوردستانێ کر کو ل ژێر سەرپەرشتیا بریتانیا بن[٦٨].

---

([63]) Chassan. R.attiya, op. cit., p. 179.

([64]) Ibid, p. i. 79.

([65]) فيليب ويلارد ايرلاند، العراق، دراسة في التطور السياسي، ترجمة جعفر الخياط، (بيروت،١٩٤٩)، ص ١٠٠.

([66]) Lt. Col. Sir Arnold Wilson, op. cit.,i.p.179.

([67]) سؤدد كاظم مهدي، المصدر السابق، ص ٩٤.

([68]) احمد عثمان ابوبكر، المصدر السابق، ص ١٦.

ئـەڤ گهورینـا د سیاسـەتا ویلـسونی دا پەیـدابووی دەربـارەی کێـشەیا کـوردی، ژ ئەگـەرێ پەیـداکرنا فـشارەکێ بوویـە ل سـەر خـەلکێ میزۆبۆتامیـا، ئەگـەر هـات ودژی بەرژەوەندیێن بریتانیا راوەستیان، ل وی دەمی دێ بێ بـەهر بـن ژ هاریکاریـا بریتانیـا ژ بۆ گرێدانا ویلایەتا میسل ب میزۆبۆتامیا ڤە[٦٩].

پێشنیازێن ویلسونی بوونە جهێ گرنگیپێدانا سەرکردێن سیاسیێن بریتـانی،و ل دۆر ڤان پێشنیازا د. جی هوکارپ (بەرپرسێ ئێکێ د وەزارەتا شەرِی دا) داخوازا جێ بە جێ کرنا پێشنیازێن ویلسونی کریە سەبارەت دامەزراندنا (دەولەتکێن) کوردی ژ بۆ پاراسـتنا بەرژەوەندیێن بریتانیا، وهـەر د ڤـی بـواری دا مێژوونڤیـسێ ئنگلیـزی (ئارنۆلـد تـوینبی) پێشنیازێن ویلسونی دووپاتکرینە وداخوازا رژێمەکا کونفدرالی ل کوردستانێ کریە[٧٠].

پێشنیازێن ویلسونی سـەبارەت دامەزرانـدنا (دەولـەتکێن) کـوردی ل کوردسـتانێ د بـەروەخت بـوون، وپـشتی ئـەو پێـشهاتێن سیاسـی ولەشـکەری ئـەڤێن ل کوردسـتانێ پەیدابووین، نەخاسمە پشتی پەرپابوونا شـورەش وسـەرهلدانێن کـوردی ل سـالا ١٩١٩، سیاسەتا ویلسونی هاتە گهورین وداخوازا گرێدانا ویلایەتا میسل ب میزۆبۆتامیـا ڤـە کـر، وچەسپاندنا دەسەلاتداریا بریتانیا ئێکسەر، وب دوماهی ئینانـا هـەر جـۆرە قەوارەیـەکێ سـەربەخۆ ل دەڤـەرێ، ول دویـڤ هـزرا ویلـسونی ئـەڤ شـۆرەش وسـەرهلدانە مەترسـی پەیداکریە ل سەر ئێمناهیا میزۆبۆتامیـا وئێرانـێ ودێ بنـە پالـدەر ژ بـۆ پەیـدابوونا ڤـان جـۆرە شۆرەشـا ل میزۆبۆتامیـا وئێرانـێ، ئـەڤ چـەندە ژی مەترسـیاکا مەزنـە ل سـەر پاشەرِۆژا پەرژەوەندیێن بریتانیا وئەمنا وێ ل دەڤەرێ[٧١].

ئـەڤ گهورینـە د سیاسـەتا ویلـسونی دا پەیـدابوی ب شـێوەیەکێ دیـار د برۆسـکا (برقیە) ویلسونی دا بۆ حکوومەتا هندێ فرێکری ل شواتا ١٩١٩ێ دیار دبیت، ووی دیتنا خۆ بۆ چارەسەرکرنا کێشەیا کوردی ب ڤی شێوەیی دەربری:

---

([69]) المصدر نفسه، ص ١٧.

([70]) المصدر نفسه، ص ١٧.

([71]) W.r.hay, op.cit., p.p. 60 – 61.

١- دەولەتا عیراقیٚ یا نوی دڤێت پێك بهێت ژ ویلایەتێن (بەسرا - بەغدا - میسل) زێدەباری ویلایەتا (دیرەلزوور).

٢- ئەڤ دەسەلاتداریە دیٚ یا پشتگیرکری بیت ژ لایێ حکوومەتا بریتانیا ڤە نەك میرەکێ عەرەب.

٣- دڤێت پشگیریەکا لەشکەری وفرۆکەوانی بهێتەکرن بۆ ڤیٚ دەسەلاتداریێ.

٤- چار نوینەرێن بریتانی بهێنە دانان ل ویلایەتێن (بەسرا - بەغدا - فرات - میسل).

٥- دانپێدان ب سەربەخۆییا کوردا ل ژێر سیبەرا بریتانیا.

هەر دڤیٚ بروسکیٚ دا ویلسونی جەخت ل سەر ویٚ چەندیٚ کر کو ئەڤ پێشنیازە نەهێنە گەنگەشەکرن ل دان وستاندێن کۆنگرەیی ئاشتییٚ ل پاریس، وئەگەر بارودۆخەکیٚ نوی پەیدا بوو ل دۆر کوردستانیٚ د کۆنگرەییٚ دا، ل وی دەمی ئەو ویلایەتێن دکەڤنە ژێر دەسەلاتداریا بریتانی دیٚ بنە (٥) ویلایەت ل گوری (٤) [٧٢].

بۆ پتر گەنگەشەکرنا پێشنیازێن ویلسونی دەربارەی کێشە یا کوردی، حکوومەتا بریتانی داخواز ژ ویلسونی کر کو بەرەف پاریس بکەفتە ڕیٚ، و ل ڕۆژا ٢٥یٚ شواتا ١٩١٩ چاڤپێکەتنەك د گەل مونتیاکو (سەرۆکیٚ شاندیٚ بریتانی ل کۆنگرەی) ئەنجام دا و هەر وەسا هەڤدیتن د گەل (ئیٚرپر بلفور ) وەزیریٚ دەرڤەییٚ بریتانی) کرن، وگەنگەشە ل دۆر پاشە ڕۆژا میزۆبۆتامیا وباشووریٚ کوردستانیٚ هاتنە کرن[٧٣].

پشتی ویلسونی مەزنە بەرپرسێن بریتانی ئاگەهدار کرین ل دۆر هەلویستیٚ وی ژ کێشەیا کوردستانا باشوور، ویلسون بەرەف لەندەن کەفتە ڕیٚ ژ بۆ دیتنا بەرپرسێن بریتانی یێن پەیوەندی هەی ب کێشانا نەخشەییٚ سیاسەتا بریتانیا ل ڕۆژهەلاتا ناڤەراست و ل ڕۆژا ١٧ی نیسانا ١٩١٩یٚ ئامادەی کۆمبوونێن لیژنەیا کاروبارێن ڕۆژهەلاتی بوو ئەوا ب سەرکرداەتیا (جورج کیرزن) بریکاریٚ وەزیریٚ دەرڤە، و د ڤیٚ کومبونیٚ دا ویلسونی (٢) پێشنیازێن خو پێشکێشی لیژنیٚ کرن ژ بۆ ب ڕێڤەبرنا

---

([72]) Lt.col.sir Arnold Wilson,op.cit.,I,p.p. 371 – 322.

(73) فیلیب ویلارد، المصدر السابق، ص ١٣٩.

دەڤەرێن كوردی، پێشنیازا ئێكێ دامەزراندنا كوردستانەكا ئۆتۆنۆمی ناڤەندا وێ میسل بیت، كو ئەڤ چەندە ژی دێ حەزا كوردا جێ بە جێ كەتن ودێ بیتە هۆكارێ دامەزراندنا دەولەتا كوردی كو زۆربەی دانیشتوییێن وێ كوردن، وپێشنیازا دووێ گرێدانا ویلایەتا میسل ب میزۆبۆتامیا ڤە بوو د گەل دامەزراندنا هندەك (دەولەتكێن) كوردی ل دەور وبەری ویلایەتا میسل، وویلسونی هندەك نموونە ژی بو ڤان (دەولەتكان) ئینایە مینا دەولەتا سلێمانیێ ورەواندز وئامێدیێ وبۆتان، كو بهێنە ب رێڤەبرن ژ لایێ كەسایەتییێن كورد ل ژێر سەرپەرشتیا راوێژكارێن بریتانی، بەلێ دڤێت گرێدای بەغدا بن.

هەر وەسا ویلسونی د ڤێ پێشنیازێ دا دیاركر كو دەڤەرێن چیایی دڤێت پتر ئازادی و دەسەلاتداری هەبن ژ وان دەولەتێن دكەڤنە دەشتێ، ویلسونی دیار كر كو ئەگەر حكوومەتا بریتانی پێشنیازا دووێ قەبوول كر ل وی دەمی زاخو ـ ئاكرێ ـ هەولێر دێ ل ژێر سنورێ ویلایەتا میسل بن(٧٤). و د دان وستاندێن خۆ دا د گەل بەرپرسێن حكوومەتا بریتانی، ویلسون شیایە ئەوان قایل بكەت ل دۆر پێشنیازێن خۆ دەربارەی كێشەیا كوردستانا باشوور، وكێرزنی پشتەڤانیا خۆ بۆ ڤان پێشنیازا دیار كر نەخاسمە گرێدانا ویلایەتا میسل ب میزۆبۆتامیا ڤە ودامەزراندنا (دەولەتكێن)كوردی ل دەور وبەرێن ویلایەتا میسل(٧٥).

ژ لایەكێ دی ڤە ئەو شۆرەش وسەرهلدانێن دژی دەسەلاتداریا بریتانی پەیدابووین ل كوردستانا باشوور بوونە هۆكارێ گهورینا سیاسەتا وەزارەتا هندستانێ بەرامبەر كێشەیا كوردی، وبریارا ڤەكێشانا لەشكەرێ بریتانی ل كوردستانێ هاتەدان، نەخاسمە پشتی ژمارەیەكا مەزن ژ سەربازێن بریتانی ل دەڤەرێ هاتینەكوشتن(٧٦).

ویلسون ب توندی دژی ڤێ بریارێ رەواستیا، ودەست ب دان وستاندنان د گەل مەزنە سەركردێن بریتانی كر، ودووپات كر كو ڤەكێشانا لەشكەرێ بریتانی ژ كوردستانا

---

(74) احمد عثمان ابوبكر، المصدر السابق، ص ١٠١.

(75) المصدر نفسه، ص ١٠١.

(76) Lt.col.sir.arnold Wilson,op.cit,ii,p.142.

باشـوور هەلەیـەکا ئیـستراتیجی یـا مەزنـە ومانـا لەشـکەرێ بریتـانی زۆرا پێتڤیـە ژ بـۆ پاراستنا ئێمناهیێ ل کوردستانێ ومیزۆبۆتامیا.

هەر وەسا ویلسونی دیارکریە کـو لیوایـا سـلێمانیێ ژ لایـێ جـوگرافی وئیـستراتیجی پـشکەکە ژ عێراقـێ، وئەگـەر کـورد ب حـەزا خـۆ ل دەڤـەرێ مـان، دێ بیتـە ئەگـەرێ مەترسیەکا بـەردەوام ل سـەر میزۆبۆتامیـا، ودێ شـەڕ وهـەڤرکیێن بـەردەوام د ناڤبـەرا کورد وعەرەبان دا پەیدابن، ئەڤ چەندە ژی دێ حکوومـەتا بریتـانی مـەجبوور کـەتن کـو لەشکەرە کێێ مەزن رەوانـەی دەڤـەرێ بکـەت ژ بـۆ پاراسـتنا بەرژەوەنـدیێن خـۆ یـێن سیاسی وئابووری(٧٧).

وەسا دیارە کو ویلسون شیایە ب فێلبـازی دەسـەلاتداریا حکوومـەتا بریتـانی قایـل بکەت ل دۆر پێشنیازێن خـۆ سـەبارەت کێـشەیا ویلایـەتا میـسل، لـەوما مونتیـاکو(٧٨) د برۆسکەکێ (برقیە) دا بۆ ویلسونی ل ٩ی گولانا ١٩١٩ێ دەستویری دایێ ژ بۆ پێڕابوونـا کـارێ پێتڤـی د دامەزرانـدنا (٥) پارێزگـەهان دا بـۆ عـەرەبا د گـەل پارێزگـەها میـسل، ودامەزرانـدنا هنـدەك (دەولـەتکێن) کـوردی ل دەور وبـەرێن ویلایـەتا میـسل ل ژێـر سەرپەرشتیا بریتانی(٧٩).

دەسـەلاتدارێن بریتـانی دویڤـچوونەکا بـەردەوام دکـر ل دۆر پێـشنیازێن ویلـسونی، وەزارەتا هندستانێ د برۆسکەکێ دا ل ٥ی حزیرانا ١٩١٩ێ داخواز ژ ویلسونی کریـە بـیر وبوچـوونێن خـۆ دیـار بکـەت دەربـارەی وان دەڤـەرێن حکوومـەتێن کـوردی لێ بهێنـە دامەزراندن وئایا هەر یێ بەردەوامـە ل سـەر بـیر وبوچـونێن خـۆ سـەبارەت دویرخـستنا ئورفە ودیاربەکر ژ دەولەتا نوی یا عیراقێ.

---

(77) دیڤیدکورن، الرجلان اللذان الحقا الکرد بالعراق، بیرسي کوکس وارنولد. ویلـسون، ترجمـة سـیلڤان سایدو، (اربیل، ٢٠٠٧)، ص ص٣٤ ـ ٣٦.

(78) Lt.col.sir Arnold Wilson,op.cit.,ii,p.142.

(79) ولید حمدي (الدکتور)، الکرد والکردستان في الوثائق البریطانیة، دراسـة تاریخیـة وثائقیـة، (لنـدن، ١٩٩١)، ص ٨٨.

